قەدەغەکردنی

# مۆسیقا و گۆرانی

## لەژێر رۆشنایی
## قورئان و فەرموودە و وتەی زانایان

نووسینی
باوکی عبدالله

پێداچوونەوەی
م. صلاح الدین

# قەدەغەکردنی گۆرانی و مۆسیقا لەژێر ڕۆشنایی قورئان و فەرموودە و فەرمودەی زانایان

نوسینی

باوکی عبدالله

پێداچونەوەی

م.صلاح الدین

چاپی یەکەم

١٤٣٢ کۆچی

٢٠١١ زاینی

بسم الله الرحمن الرحيم

## دپیناسی کتێب


❖ ناوی کتێب : قەدەغەکردنی گۆرانی و مۆسیقا لەژێر ڕۆشنایی قورئان و فەرمووده و فەرمودەی زانایان

❖ نوسەر باوکی عبدالله

❖ پێداچونەوەی : م.صلاح الدین .

❖ ساڵی چاپ : ۲۰۱۱

❖ نوبەی چاپ : یەکەم .

❖ شوێنی چاپ : چاپخانەی زانا . شەقامی مەولەوی

❖ ژمارەی سپاردن : له بەرێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشیەکان ژمارەی (۱۹۹۷) ی ساڵێ (۲۰۱۱) ی دراوەتێ .

بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشەكی:

إنَّ الحَمْدَ لله نَحْمَدهُ وَنَستَعينُهُ وَنَستَغفرُهُ ، وَ نَعُوذُ بالله مِنْ شُرُرِ انْفُسِنَا و سَيِئاتِ اعمَالِنَا مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلاَ مُضِلَ لَهُ ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ ، و أشهَدُ أنْ لاَإلهَ إلا الله وحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ ، و اشْهَدُ أنَّ مُحَمَداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.

﴿يَا أيُّهَا الَّذِينَ ءامَنُواْ اتَّقُواْ اللهَ حَقَّ تُقَاتِهِ ولاَ تَمُوتُونَّ إلاَّ وأنتُم مُّسْلِمُونَ﴾ال عمران - ١٠٢-

﴿ يَا أيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيراً وَنِسَآءَ واتَّقُواْ الله الَّذِى تَسَاءَلُونَ بِهِ وَلأَرْحَامَ إنَّ الله كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيباً ﴾النساء ١

﴿يَا أيُّهَا الَّذِينَ ءامَنُواْ اتَّقُواْ الله وقُولُواْ قَولاً سَدِيداً *يُصْلِحْ لَكُمْ أعْمَالَكُمْ وَيَغْفِر لَكُمْ ذُنُوبَكُم ومَنْ يُطِعِ الله ورسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزاً عَظِيماً ﴾الاحزاب ٧٠_٧١

اما بعد: فان اصدق الحديث كتاب الله ، وخيرالهدي هدي محمد (صلى الله عليه وسلم) وشر الامور محدثاتها، وكل محدثة بدعة وكل بدعة ضلالة وكل ضلالة في النار .

**پاش ئەمە :**

بۆ هەموو خوێنەرو مووسڵمانێکی بەڕێز بۆ هەموو ئەوانەی کەدڵیان پاکە لەژەنگی شوبوهات و شەهەوات بۆ هەموو ئەوانەی کەگوێ بیستی حەقن و ملکەچی دەنوێنن لە ئاستی حەق وڕاستی، بێگومان پێنووس دانان لەسەر کاغەز ئاسان وسادەو ساکارە بەڵام ڕۆشن کردنەوەی حەق و ڕاستی دەربڕین تیایدا قورس و دژوارە.

گومان نیە لەوە دا لەتەواوی دونیا مووسڵمانان توشی شڵەژاوی و نائارامی بوون بەجۆرێ ئەگەر سەیری ئەم ئوممەتە بکەیت دەڵێی ئیسلام لە وادیەکەو مووسڵمانان لەوادیەکی تر ئەگەر چی شێخ حەسەنی بەصری ڕەحمەتی خوای لێبێت دەفەرمووێ :﴿لَقَدْ أدْرَكْنَا أقْواماً أي الصَّحابة أهْلُ القَرن الاول كُنَّا في جَنْبِهِم لُصُوصاً﴾

واتە: گەیشتوینەتە قەومەکان واتە هاوەڵانی بەرزی پێغەمبەر ﴿صلى الله عليه وسلم﴾ ئێمە لەتەك ئەواندا لەچاو ئەواندا وەکوو دز واین .

ئەوە بەنەوە لەبەر زۆری شوبهەی خراپ یان شەهەوات و ئارەزوکاری خەڵکی سەر لە خۆی و خەڵکی دەشێوێنن ، بۆیە ئەوە بەنەوە برینی تازە سەر هەڵدەدات کە لەنەوەی پێش خۆیدا نەبووە تاگەیشتۆتە ئەو ڕادەیەی کە (الرَّبِيعُ بنُ خُثَيْم)دەفەرمووێ:﴿لَوْ رَآنَا أصْحَابُ مُحَمدٍ ﴿صلى الله عليه وسلم﴾ لَقَالُوا هؤلاَءِ لاَيُؤمِنُونَ بِيَومِ الحِسَابِ﴾[1]

واتە:(ئەگەر هاوەڵانی پێغەمبەر ﴿ صلى الله عليه وسلم﴾ ئێمەیان ببینیایە ئەیان ووت ئا ئەمانە بڕوایان بەڕۆژی لێپرسینەوە نیە)

ئێمەش دەڵێین ڕەحمەتی خوا لە( شێخ حەسەنی بەصری و ڕەبیعی کوڕی خوثیم) بێ لەسەردەمی ئێمەدا بونایە چیان دەوت!!!!؟

---

1 ~ راجع (فيض القدير) للعلامة المُناوي (٣|٤٧٩) و(الحلية) ٢|١٠٨ ~١٠٩و

خوێنـــەری بـــەڕێز: بەپـــشتیوانی خـــوای تعـــالی هـــەوڵ ئـــەدەم لـــە نووسینەکەمدا بەڕۆشنی حوکمی گۆرانی و مۆسیقا لە ژێر ڕۆشنای قورئان و سوننەت و فەرموودەی هاوەڵان و زانایان بخەمە بەردەستی هەموو موسڵمانێکی دڵسۆزو بەوەفا بۆ دینەکەی بەئومێدی ئەوەی سەرچاوە ڕوونەکانی ئیسلاممان لالێڵ نەبێت وە گومان و دوودڵی لەدڵماندا نەمێنێ هیوادارم ببێتە مایەی ڕواندنەوەی ئەو شوبهە خراپانەی کەدڵی مووسڵمانانیان پێ نەخۆش خستوە ئەگەر نەشم توانی ئەواکە متەرخەمی و تەخسیر لە خۆمە نەك لەسەرچاوە پاکەکەی ئیسلام چونکە بێگومان هەر کەسە بەقەدەر تواناو زانست و زانیاری خۆی پێهەڵدەسوڕێ ﴿وَفَوقَ كُلِّ ذي علمٍ عَلِيم﴾[2]
وەئەگەر لە شتێکدا نەپێکان بەدی کرا ئەوا کورد ووتەنی لەوقوڕە هەر ئەو تۆزە هەڵدەستێ منیش هەر ئەو تۆزەم لێ هەڵدەستێ.

---

2 ~سوره (یوسف) الایه ٧٦

## ﴿فیتنە لەسەردەمی ئێمەشدا﴾

گومـان نیـە لـەوەدا کەمووسـڵمانان بەدەسـتی فیتنــەوە دەنــاڵێنن جۆرەها فیتنـە ڕوی کردۆتـە خـەڵکی مووسڵمان و خـەڵکی خوانـاس و دینـدار ، فیتنـەکان ئەوەنـدە زۆرن مووسـڵمانانی تووشـی دڵە ڕاوکـێ و نائارامی کردووە فیتنەی شوبوهات ، فیتنەی شـەهەوات، فیتنەیـەك کـە حەق و ڕاستی بـە بـەتاڵ بزانـرێ ، وەبـەتاڵ بەحـەق و ڕاستی بزانـرێ تــاوای لێبێــت فیتنــەکان دەگەنـــە دڵ وە هـــەرجارەی فیتنەیـــەك سەرهەڵدەدات ئیمانداری ڕاستەقینە دەڵێ ئەمجارە بـەم فیتنەیـە لـەناو دەچـین ، بــەڵام لادەچـێ و فیتنەیــەکی تــر سـەرهەڵئەدات ، پاشــان مووسڵمانان وابیر دەکەنـەوە کـەنزیکی تیاچونیانە و دەڵێن ئـەم جـارە بەم فیتنەیـە لـەناو دەچین ئـەویش لا دەچێت و فیتنەیـەکی تـر دێـت غەیری ئەو فیتنانە بۆیە بـەردەوام دەبێـت تـا ڕۆژی دوایـی هـەرجارەی لە لایـەك و هـەرجارەی لەسـەر دەسـتی کۆمـەڵێ کـەس سـەرهەڵدەدات ، چەند خەڵکی هەن دینەکەیان ئەفرۆشن بەکەمێ لە دونیا !!!!
یان دینەکەیان ئەفرۆشن لەپێناوی کورسی و پلە وپایە!!!!!!
یان حیزب و پارە !! یان شەهوەت و شوبهەی خراپ!!!

خوێنەری بەڕێز:

فیتنــەکان زۆرن فیتنــەی حــەڵاڵ و حــەڕام لــە تــەواوی دونیــاو کۆمـەڵگا ئیـسلامیە کـانیش ئـەوەتا ڕیبـا حـەڵاڵ دەکرێـت ، مۆسـیقاو ڕەقس و سـەما نـاو دەبـرێ بەفـەن !! تێکـەڵی ژن و پیـاو بـەناوی کـۆڕو سیمینار ناو دەبرێت بە بەرەو پێش چوون و پێشکەوتن!!! عـەرەق نـاو دەبـرێ بەمەشـروباتی ڕۆحـی !!! مۆسـیقاو زوڕنـاو شمشاڵ و تـەپڵ نـاو

دەبرێ بە چێژی ڕۆحی !!! بێگومان ئەوەی کەئێستا ناو دەبرێ بە چێژی ڕۆحی ماڵی زۆرێك لە مووسڵمانانی گرتۆتەوە ئەگەر دەرگاکانی لێدابخرێ هەر خۆی بەژووردا دەکات ، وە پێشتر پێغەمبەری خوا ﴿صلی الله علیه وسلم﴾هەواڵی داوە پێمان و پێی فەرموویین : ( عَنْ أُسَامَةَ(رضی الله عنه) أنَّ النبي﴿صلی الله علیه وسلم﴾ ﴿أشرَفَ عَلَى أُطُمٍ مِنْ آطَامِ المَدِينَةِ، ثُمَّ قَالَ:﴿ هَلْ تَرَوْنَ ما أرَى؟ إنِّ لأرَى مَوَاقِعَ الفِتَنِ خِلاَلَ بُيُوتِكُمْ كَمَوَاقِعِ القَطْرِ﴾[3]

واتە:﴿ پێغەمبەر ﴿ صلی الله علیه وسلم﴾ بەسەر باڵەخانەیەکدا لە باڵە خانەکانی مەدینەدا سەرکەوت و پاشان فەرمووی : ئایا ئەوەی من دەیبینم ئێوە دەیبینن ؟ بێگومان من لە نێو ماڵەکانتاندا شوێنگەی فیتنە دەبینم وەکو شوێنگەی بارانی بە لێزمە﴾

کەواتە دەبێت موسڵمانان بە ئاگا بن خۆپارێز بن دەست بگرن بەدوو سەرچاوە گەورەکەی ئیسلام کەقورئان و سوننەتە بیکەنە بەرگری کاریێ لە دڵیان تاوەکو بەهۆی زۆری فیتنەکانەوە ڕەش نەبێت ، وە دەبێ ئێمەش خۆمان بێ ئاگا نەکەین لەو فیتنە یەی کەدڵ ڕەش دەکات و دووروی تیا ئەچێنێ فیتنەیەك کەمایەی گومڕابونی موسڵمانانە کەئەویش گۆرانی و مۆسیقایە ، بۆیە دەبێ بزانین کەئێمە لە فیتنەدا دەژین وە ئەگەر کەسێ بپرسێ و بڵێ باشە چۆن ئێمە لە فیتنەدا دەژین؟

---

3 - اخرجه البخاري ، كتاب فضائل المدينة ، باب آطام المدينة (١٨٧٨) ، ومسلم في الكتاب الفتن واشراط الساعة ، باب نزول الفتن كمواقع القطر (٢٨٨٥) من حديث اسامة بن زيد .

ئـــەوا دەڵـــێم وەلأمەكـــەی لای حوزەیفـــەی كـــوڕی یەمانـــە ﴿رضی الله عنهم﴾ كەدەفـەرمووێ:﴿إنَّ الفِتْنَـةَ تُعْرَضُ عَلَـى القُلُـوبِ ، فَأَيُّ قَلْـبٍ أُشْـرِبَهَا نُكِتَتْ فِيهِ نُكْتَةٌ سَوْداءُ ، فإنْ انْكَرَها نُكِتَتْ فِيـهِ نُكْتَةٌ بَيْـضَاءُ ، فَمَنْ اَحَبَّ مِنْكُمْ ، انْ يَعْلَمَ هَلْ اصَابَتْهُ الفِتْنَةُ امْ لاَ ، فَلْيَنْظُرْ فَإنْ كَانَ يَـرَى حَرَاماً مَاكَـانَ يَـرَاهُ حَـلاَلاً ، اوْ يَـرَى حَـلاَلاً مَاكـانَ يَـرَاهُ حَراماً ، فَقَـدْ اَصَابَتْهُ الفِتْنَةُ﴾[٤]

واتە:﴿بێگومـان فیتنـە دێت بەسـەر دلأنـدا جاهـەر دڵێـك هەڵیبمـژێت و بیخواتەوە ئەوا خاڵێكی ڕەشی تیادا دروست دەبێت وەهەر دڵێك حـەزی پێ نـەكات و بـەرگری بكات ئـەوا خـاڵێكی سـپی تێیـدا دروسـت دەبێـت جاهەركەسێك پێی خۆشە بزانـێ كـە تووشـی فیتنـە بـووە یـان نـا ئـەوا باسەیر بكات كاتێك حەڕامێك دەبینێت ئەوا ئەو بـە حـەلاڵی دەبینێـت یان حەلاڵێك دەبینرێ بەحەڕام بزانرێ واتە بینینی حەلاڵ بـە حـەڕام وەبینینی حەڕام بەحەلاڵ ئەوا بێگومان تووشی فیتنە بوون.

بۆیە دەڵێین لـە ئێستادا چـەند حـەڕام هەیـە كـە بـە حـەلاڵ دەبینـرێ لەبـەر خـاتری بۆچـونی كەسـێ یـان شـوبهەی خـراپ یـان شـەهەوات و ئارەزوكاری خوای تعالى ئێمەش و ئێوەشی لێ بپارێزێ آمین،آمین .

4 _ اخرجه الحاكم في المستدرك كتاب الفتن والملاحم (٨٤٤٣) وابو نعيم في الحلية ( ٢٧٢~ ٢٧٣) ونعيم بن حماد في الفتن (١١٠~١١٣) ،وابن ابي شيبة في المصنف كتاب الفتن ( ٨| ٦٢٨) والداني في السنن الواردة في الفتن (٢٦) وابن عساكر في تاريخ دمشق ( ٣٤| ٢٥٨).

# پێش چونە ناو ڕاڤەی قورئانی پیرۆز پێویستە چی بزانین؟

خوێنەری بەڕێز:

پێویستە مووسڵمانان بزانن کەپێش تەفسیروڕاڤەکردنی قورئانی پیرۆز دەبێت چەند زانیاریەکمان هەبێت سەبارەت هەم بەڕاڤە کردنی قورئانی پیرۆز هەم بەوەرگرتنی ڕاڤەی قورئانی پیرۆز، وەدەبێت ئەوەش بزانین کەڕاڤەی قورئانی پیرۆز بەهەواو ئارەزوی خەڵکی ناکرێت وەهەر کەسێك بەهەواو ئارەزوی خۆی ڕاڤەی قورئانی پیرۆز بکات تەنها بەبۆچونی خۆی ئەوا باشوێنی لە ئاگری دۆزەخ خۆشکات هەروەکوو لەم ڕیوایەتەدا هاتووە ﴿ حدثنا وكيع قال سفيان عن الاعلى الثعلبي عن سعيد بن جبير عن ابن عباس قال:﴿قَالَ رسول الله «صلى الله عليه وسلم»مَنْ قَالَ فِي القُرانِ بِغَيرِ عِلْمٍ فَلْيَتَبَوُا مَقْعَدَهُ مِنَ النَّار﴾[5]

واتە:﴿ هەرکەسێك لەقورئان بدوێت بەبێ زانست و زانیاری ئەوا باشوێنی خۆی لە ئاگر دانێت﴾

بۆیە پێم باش بوو پێش ئەوەی بچینە خزمەتی ئەو ئایەتە پیرۆزانەی کەدەلیل و بەڵگەن لەسەر حەڕامی مۆسیقاو گۆرانی.........هتد ، بچینە خزمەتی چەند زانیاریەك سەبارەت بە پێشەکی و بنچینەی تەفسیر تا بزانین تەفسیر چۆن دەکرێت وچەند پلەوپایەی هەیە

---

5 _اخرجه الترمذي (٢٩٥٠) وقال حسن صحيح والنسائي في الكبرى (٨٠٨٥) من حديث ابن عباس ، واخرجه ابوداود برواية بن العبد كما في التحفة ٤|٤٢٣~ من حديث مسدد عن ابن عوانة وصححه ابن القطان كما في النكت الظرف ٤٢٣٤.

ئـــەوەش لەڕوانگـــەی کتێبـــی﴿ شـــرح مقدمـــة في اصـــول التفـــسير ﴾چێژوەردەگرین کەچەند پلەیەك باس دەکات لەچۆنێتی ڕاڤەکردنی قوڕئانی پیرۆز، سەرەتا لە پلەی یەکەمی تەفسیرو ڕاڤەی قوڕئانی پیرۆز دەست پێ دەکەین کەبریتیە لە:

﴿كَلاَمُ الله فَيُفَسرُ القرانَ بـالقرانِ لأنَّ الله تَعَالى هُوَ الَّذي انْزَلَـهُ وَهُـوَ اعلم بِمَا أرادَ الله﴾

واتە:﴿ فەرموودەی خوای تعالی ﴿جل جلاله ﴾ هـەر بەفـەرموودەی خـوای تعالی﴿جل جلاله ﴾ واتـە ڕاڤـەی قوڕئـانی پـیرۆز بـە قوڕئـانی پـیرۆز لەبـەر ئەوەی کەخوای تعالی ﴿جل جلاله﴾ خـۆی ناردویەتیـە خـوارەوەو هـەر خـۆی دەزانێت مەبەستی پێ ی چیە ، وەئەم ڕاڤەکردنە بەرزترین مەرتەبـەو پلەی ڕاڤەیە کە ڕاڤـەی قوڕئـانی پـیرۆز بـە قوڕئـانی پـیرۆز بکرێـت بـۆ نمونـە: خـوای تعـالی ﴿جل جلاله﴾ دەفەرموێت:﴿الاَ إنَّ اولِيَآءَ الله لاَخَـوْفٌ عَلَيْهِمْ ولاَ هُمْ يَحْزَنُونَ﴾[٦]

دەی دەپـرسرێ ﴿ فمن اولياء الله﴾ واتە دۆستانی خـوای تعالی ﴿جل جلاله ﴾کێن خوای تعالی ﴿جل جلاله ﴾خۆی تەفسیری دەکات و دەفـەرموێت :﴿ الَّذِينَ ءَامَنُواْ وَ كَانُواْ يَتَّقُونَ﴾ [٧]

واتە:﴿ ئەوانەی کەئیمانداڕن و خۆپارێزن ﴾

بۆیە شیخ الاسلام دەفەرمووێ:﴿مَنْ كَانَ مُؤمِناً تَقِياً كَانَ لله وَلِياً﴾[٨]

واتە﴿هەرکەسێك ئیمانداری ڕاستی و خۆپارێز بێت ئەوە دۆست و وەلی خوای تعالی یە ﴿جل جلاله﴾ .﴾ نموونـەی تر سـەبارەت بەڕاڤـەی قوڕئـانی

---

6 _﴿ يونس﴾ الاية ٦٢

7 _﴿يونس﴾الايه٦٣

8 _﴿الفتاوى﴾ (٢٥|٣١٦ ) و( ٢٨|٥٧٠)

پیرۆز بەقورئانی پیرۆز خوای تعالی ﴿جل جلاله﴾دەفەرموویت:﴿ وَمَآ ادْراكَ مَا الطَّارِقُ﴾[9]

ئەگەر پرسیار بکرێت ﴿ والسَّمَاءِوالطَّارِقِ﴾چی یە؟

دەڵێن مانای (طارق) واتە : يطرق ليلا!!!!!بەلام لێرەدا وانیە مەبەست بە(الطارق) خوای تعالی خۆی ڕاڤەی دەکات و دەفەرمووێ:﴿النَّجْمُ الثَّاقِبُ﴾~١٠~ واتە:﴿بەمانای ئەستێرەی درەخشاوەی کونکەرە﴾.[10]

وەلەئایەتێکی پیرۆزی تردادەفەرموێت:﴿وَالأَرْضَ بَعْدَ ذَلِكَ دَحَاهَا﴾[11]

دەی خوای تعالی ﴿جل جلاله﴾ خۆی ڕاڤەی دەکات و دەفەرمووێ:﴿أَخْرَجَ مِنْهَا مَاءَهَا وَمَرْعَاهَا*وَالْجِبَالَ أرْسَاهَا﴾[12]

کەواتە ئەمە جۆری یەکەمە لە ڕاڤەی قورئانی پیرۆز وەیەکەم مەرتەبەو پلەی ڕاڤەی قورئانی پیرۆزە.

مەرتەبەو پلەی دووەم:﴿ كَلاَمُ رسول الله ﴿صلى الله عليه وسلم ﴾ فَيُفسر القرآن بالسُنَّة،لأنَّ رسول الله ﴿صلى الله عليه وسلم ﴾مُبَلغٌ عَنِ الله تعالى ، فَهُوَ أعْلَمُ النَّاسِ بِمُرَادِ الله تعالى بِكَلاَمِهِ﴾

واتە:﴿بەفەرموودەی پێغەمبەری خوا ﴿صلى الله عليه وسلم﴾ قورئانی پیرۆز ڕاڤە دەکرێت چونکە پێغەمبەری خوا﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ ڕاگەیەنراوی خوای تعالی یە وە زاناترین کەسە ﴿صلى الله عليه وسلم ﴾ بەمەبەست و واتای قورئانی پیرۆز وەبێ گومان هیچ بەربەرەکانێیەك

---

9 _﴿الطَّارِق﴾ الاية ٢

10 _﴿الطارق﴾الاية ٣.

11 _﴿النازعات﴾الاية ٣٠.

12 _﴿النازعات﴾ الاية ٣١~ ٣٢.

لەمەدانیە کەمەرتەبەو پلەی دووەمی تەفسیری قورئانی پیرۆز بە سوننەتی پێغەمبەرە ﴿صلی الله علیه وسلم﴾ وە لە نمونەی تەفسیری قورئانی پیرۆز بە فەرموودەو سوننەتی پێغەمبەر﴿صلی الله علیه وسلم ﴾ بۆنمونە: خوای تعالی ﴿جل جلاله﴾ دەفەرموێت ﴿لِلَّذِينَ أَحْسَنُواْ الْحُسْنَى وَزِيَادَةٌ﴾ [13]

واتە:﴿بۆئەوانەی چاکەیان کردووە پاداشتی چاکترە~بەهەشت~ وەزیاتریشیان هەیە کەبینینی خوای تعالی یە ﴿جل جلاله﴾ ﴾ خوای تعالی ﴿جل جلاله﴾ ئێمەش و ئێوەش بێ بەش نەکات ، دەی ئەگەربلێین ﴿مَاهي الزِيَادة﴾؟ زیادە بەشتێکی زیاد دەلێین بەلام ئەو شتە زیادەیە چیە؟ پێغەمبەری خوا﴿صلی الله علیه وسلم﴾ڕافەی دەکات بە بینینی خوای تعالی ﴿جل جلاله﴾ وەکو لەم ڕیوایەتەداهاتووە:﴿ عَنْ صُهَيب بن سينان عن النبي ﴿صلى الله عليه وسلم ﴾ في حديث قال في﴿فَيُكْشَفُ الْحِجَابُ ،فماأُعطوا شَيئاً أحبَّ إليهم مِن النَظَرِ الى ربِهِم عَزوجل، ثُمَّ تَلا هذهِ الاية ﴿ لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا الحُسْنى وَزِيَادَةٌ﴾ [14]

وەهەروەها خوای تعالی ﴿جل جلاله﴾ دەفەرموێت : ﴿ وَأَعِدُّواْ لَهُمْ مَّااسْتَطَعْتُم مِنْ قُوَّةٍ﴾ [15]

پێغەمبەری خوا ﴿ صلی الله علیه وسلم﴾ ڕافەی ﴿القوة﴾ ی کردوە بە ﴿الرمی﴾ وەکو لەم ڕیوایەتانەدا هاتوە: (عن عُقْبَةَ بن عَامِرٍ ﴿رضی الله عنه﴾ قَالَ :﴿سمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﴿صلى الله عليه وسلم﴾ وَهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ يَقُولُ: ﴿

---

13 _﴿یونس﴾ الاية ٢٦.

14 _صحيح مسلم (١٨١)واحمد ٤~٣٣٣.

١٥_ ﴿ الانفال﴾ الاية ٦٠

وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَّااسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ﴾ الاَ إنَّ القُوَّةَ الرَّمْيُ، الاَ إنَّ القُوَّةَ الرَّميُ، الاَ إنَّ القُوَّةَ الرَّميُ﴾(قالها ثلاثا) [16]

واته: (عقبه)ی كوڕی (عامر)﴿رضی الله عنه﴾ دەفەرموێ: ﴿لەكاتێكدا پێغەمبەر ﴿صلى الله عليه وسلم﴾لەسەر مینبەر بوو گوێم لێ بوو دەیفەرموو:﴿چەند دەتوانن هێزیان بۆ ئامادە بكەن﴾بزانن هێز بریتیه لە تیر ئەندازی ، بزانن هێز بریتیه لە تیر ئەندازی ، بزانن هێز بریتیه لە تیر ئەندازی ﴾ سێ جار دووبارەی كردەوە .

كەواتە مەرتەبەو پلەی دووەم لە ڕاڤەی قورئانی پیرۆز ڕاڤەی قورئانی پیرۆزە بە سوننەتی پێغەمبەر﴿صلى الله عليه وسلم﴾.

مەرتەبەو پلەی سێ یەم لە ڕاڤەی قورئانی پیرۆز :

﴿ كلام الصَّحابة ﴿رضی الله عنهم﴾ لاسِيَمَا ذوو العِلمِ مِنْهُمْ وَالعِنَايَةِ بالتَفْسِيرِ لإنَّ القُرآنَ نَزَلَ بِلُغَتِهِمْ وفي عَصْرِهِمْ ،ولأنَهُم بَعْدَ الانْبِيَاءِ أصْدَق النَّاسِ فِي طَلَبِ الحَقِّ وَأسْلَمهم مِنَ الاهْوَاءِ وأَطْهَرُهُمْ مِنَ المُخَالَفَات التي تَحُولُ بَيْنَ المرءِ وَبَيْنَ التَوْفيقِ لِلْصَوابِ﴾

واته:﴿ ووتەو فەرموودەی هاوەڵانی پێغەمبەر﴿صلى الله عليه وسلم ﴾ بەتایبەتی ئەوانەی كەخاوەنی زانست وزانیارین ومرەچاو چاودێری ڕاڤە دەكەن بەوردی لەبەر ئەوەی قورئانی پیرۆز دابەزیوە بە زوبان و لوغەی ئەوان وەلە سەردەمی ئەواندا دابەزیوە وەبێ گومان لەدوای پێغەمبەران ﴿ علیهم الصلاة والسلام ﴾ ڕاستگۆترینی خەڵكن لەداواكاری حەق وڕاستی وە سەلامەت ترن لە خەڵكانی ترلە هەواو ئارەزووبازی وە پاكترن لە خەڵكانی ترلە سەرپێچی سەرپێچیەك كەدەبێتە ڕێگر لەبەینی گەیشتن بە صەواب و ڕاستی واتە ڕێگرە لەپێكان و ڕاستی.

---

16 _صحیح مسلم .

ابن تيمية ڕەحمەتی خوای لێبێت سێ سیفەتیان باس دەکات :

یەکەمیان دەفەرموێت:﴿ ڕاستگۆترینی خەڵکن لە دوای پێغەمبەران ﴿علیهم الصلاة والسلام﴾ لەوەرگرتنی حەق و ڕاستی ، بێگومان ئەم شاهید یە بەربەرەکانی تێدا نیە چونکە خوای تعالی ﴿جل جلاله﴾ شاهدیان بۆدەدات ودەفەرمووێ:﴿ لِلْفُقَرَآءِ المُهَاجِرِيْنَ الَّذِينَ أُخْرِجُواْ مِنْ دِيارِهِمْ وَأَمْوالِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلاً مِنَّ الله ورِضْوَاناً وَيَنْصُرُونَ اللهَ وَرَسُلَهُ~ أُولَئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ﴾ [17]

واتە:﴿ ئەو دەستکەوتەی لەبەنی نەضیر گیرا بۆ نەدارانی کۆچ کەرانە ئەوانەی کەدەرکران لە ماڵ و سامانیان هەوڵی بەهرەی خواو ڕەزامەندی ئەو دەدەن وەیارمەتی ئاینی خواو پێغەمبەری خوا دەدەن ﴿ صلی الله علیه وسلم﴾ هەرئەوان لەڕاستگۆیانن.

وەسیفەتی دووەمیان دەفەرموێت:

﴿سەلامەت ترن لە خەڵکانی ترلە هەواو ئارەزوکاری بێ گومان لەدوای هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر﴿صلی الله علیه وسلم﴾ ئوممەتی ئیسلامی پەرشوو بڵاو بوو فراوان بوو هەواو ئارەزووکاری زۆربون بەڵام لە سەردەمی هاوەڵانی بەڕێز زۆر کەم بووە ئەگەر نەڵێین هەر نەبووە ، خوای تعالی ﴿جل جلاله﴾ لێیان ڕازی بووە لەبەر ئەوەی ئەوان شوێن هەواو ئارەزوکاری نەکەوتن وەکو خوای تعالی ﴿جل جلاله﴾ دەفەرمووێ:

﴿وَالسَّابِقُونَ الأوَّلُونَ مِنَ المُهَاجِرِينَ وَالأَنْصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُم بِإحْسَانٍ رَّضِيَ اللهُ عَنْهُمْ وَرَضُواْ عَنْهُ وَأعَدَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي تَحْتَهَا الانهَارُخَالِدِينَ فِيْهَآ أَبَداً ذَالِكَ الفَوْزُ العَظِيمُ ﴾ [18]

---

17 _﴿الحشر﴾ الاية ٨

18 _﴿ التوبة﴾الاية ١٠٠

واتـه:﴿وه پـێش کـەوتووە یەکەمـەکان لـەکۆچ کـەران و یاریـدەدەران ئەوانەش زۆر بە چاکی پەیڕەوی ئەوانیان کردووە و شوێنیان کەوتوون خوا لێیان ڕازیەو ئەوانیش لە پاداشتی خوای تعالی ﴿جل جلاله﴾ ڕازین وە خوای تعـالی﴿جل جلاله﴾بەهەشـتانێکی بـۆ ئامـادەکردون کـە ڕووبارەکـان دێن و دەچن بە ژێر یاندا تیایدا دەمێننەوە بەبێ بڕانـەوە وە ئائەوەیـە گەیشتن بە ئامانجی گەورە﴾.

سێ یەم دەفەرمووێ:

﴿پاکترن لە موخالـەفات وسەرپێـچی کەدەبێتـە هۆکـارێ بـۆ ڕێگـری لـە بەینی مرۆڤ و پێکان و حەق و ڕاستی﴾

پاکترن لە سەرپێچی و موخالەفات لەسەر پێچی کێ؟؟

سەرپێـچی خـوای تعـالی﴿جل جلاله﴾ لەبـەر ئـەوەی سەرپێـچی فـەرمانی خوای تعالی ﴿ جل جلاله﴾ وەگونـاهو تـاوان دەبێتـە ڕێگـر لـە دۆزینـەوەی حـەق و ڕاسـتی ، چـەندەها کـەس بـەهۆی گونـاهو سەرپێـچی بـێ بـەش بـوون لـە گەیـشتن بەصـەواب و ڕاسـتی چـەندەها جـار مووسـڵمانان بـێ بـەش بـوون لـە سـەرکەوتن بـەهۆی گونـاهو سەرپێـچی وەگومـان نیـە لەوەدا کەسەرپێچی و گونـاه دەبێتـە هـۆی ڕێگـری لـە پێکـان وڕاسـتی ، خوای تعالی ﴿جل جلاله﴾ دەفەرمووێت :

﴿وَالَّذِينَ اهْتَدَوْا زَادَهُمْ هُدىً وَءَاتَاهُمْ تَقْوَاهُمْ﴾[19]

واتە:﴿ئەو کەسانەی هیدایەت و ڕێنمونیان وەرگرتوە خوای تعالی ﴿جل جلاله﴾ شـارەزاییان زیـاد دەکـات و تـەقواو پارێزگاریـان پـێ دەبەخـشێت کەواتە هـەر کەسـێك هیدایـەت وەربگـرێ بـەوەی کـە خـوای تعـالی ﴿جل جلاله﴾ ناردوێتیەخوارەوە ئەوا خوای تعالی ﴿ جل جلاله﴾ بۆی زیـاد دەکـات

19 _﴿محمد﴾ الایە ١٧

وەهەرکەسێ هیدایەت وەرنەگرێت خوای تعالی﴿ جل جلاله﴾ بۆی زیاد ناکات بەڵکو کەم دەبێتەوە وەکو دەفەرموێت :﴿فَبِمَانَقْضِهِمْ مِّيثَاقَهُمْ لَعَنَّاهُمْ وجَعَلْنَا قُلُوبَهُمْ قَاسِيَةً.....﴾[20]

واتە: ﴿ئینجا بەهۆی هەڵوەشاندنەوەیان بۆ پەیمانەکەیان نەفرەتمان لێکردن و دڵە کانیانمان گێڕا بە دڵێکی ڕەق و ووشك واتە نەرم نابێ بۆ حەق و ڕاستی کەواتە پێویستە لەدوای ڕاڤەی قورئانی پیرۆز بە قورئانی پیرۆز وە ڕاڤەی قورئانی پیرۆز بە فەرموودە وە پاشان بگەڕێینەوە بۆ فەرموودەی هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ وەپاش ئەوانیش بۆ لای فەرموودەی تابیعین بەلاَم بێ گومان دەبێت ووریا بین زۆر جار لەبەر هەواو ئارەزوو یان حیزب و بەرژەوەندی یان بەناوی دەعوە و بانگەواز یان ..............هتد واز لە ئایەتی قورئانی پیرۆز دێنێت و چەندین تەئویلی بۆ دەکات یان واز لە فەرموودەی صەحیحی پێغەمبەر ﴿ صلى الله عليه وسلم﴾دێنێت یان واز لەفەرموودەی هاوەڵان دێنێت و باز دەدات ودەڵێت فلاَن تابیعی یان فلاَن زانا یان فلاَن خوێنەر وادەڵێ!!!!!!!!!!

بۆیە ئەوە هەڵەیەو نەپێکانە خاوەنەکەی بەرەو هەڵدێر دەبات،

هەربۆیە شوعبەی کوڕی حەجاج دەفەرموێت : ﴿ اقْوَال التَّابعين في الفُرُعِ لَيْست حُجة، فَكَيْفَ تَكُون حُجةً في التَفسير؟ يَعْني: انَهَا لاَتَكُون حُجةً عَلَى غَيْرِهِمْ مِمَنْ خَالفهُم وَهَذا صَحِيح ، امَّا إذَا إجْتَمَعوُا عَلَى الشيء فَلاَ يُرْتَاب في كَونهِ حُجَة، فإنْ إختَلَفوا فَلاَ يَكُون قَولُ بَعضَهم حُجَة عَلَى بَعضِ ، وَلاَ عَلَى مَن بَعْدِهِمْ ، وَيُرجِع

---

20 _﴿المائدة﴾الاية ١٣

فـي ذلـكَ إلى لُغـةِ القُـرآنِ او الـسُنَّة أو عُمـومِ لُغـة العَـرَبِ ، اواقْـوَال الصَّحَابة فِي ذَلكَ﴾[٢١]

واته:﴿ووتـەی تـابعین لـە لـق و پـۆدا نابێتـە بەڵگە ئـیتر چۆن دەبێتـە بەڵگە لە تەفسیردا ؟!! واتە نابێتە بەڵگەلەسەر غـەیری ئـەوان لەوانـەی کە پێچەوانەیانن ئەما ئەگـەر هـەموویان کۆبن لەسـەری ئـەوە گومـانی تیادانیە کە دەبێتە بەڵگە وەئەگەر ڕاجیای هەبوو هیچیان نابنە بەڵگـە لەسـەر ئـەوی تریـان وە هـەروەها نابێتـە بەڵگـە لەسـەر ئەوانـەی دوای ئـەوان لـەو حاڵەدا ئەگەڕێتـەوە بـۆ زوبـانی قورئـانی پیرۆز وسـوننەتی پێغەمبەروﷺ صلى الله عليه وسلم﴾ ووتـەی هـاوەڵانی بـەرزی پێغەمبـەر﴿صلى الله عليه وسلم﴾ پێویستە مووسڵمانان بزانن کە هاوەڵانی بەرزی پێغەمبەر ﴿صلى الله عليه وسلم﴾ کۆمەڵی بەناوبانگن لەتەفسیردا وە لـەدوای ئـەوانیش تابعین بۆیە السیوطی یەکەم جار باسی هەر چوارخەلیفە بەڕێزەکـەی پێغەمبەر﴿صلى الله عليه وسلم﴾ دەکات کەبەناو بـانگن ومەشهورن وەپاشـان باسی عبد الله کوڕی عـەباس و عبـد اللـە کـوڕی مەسعود دەکرێ ڕەزاو ڕەحمەتی خوای تعالی لەهەمویان بێت .

بۆیـــه شـــێخ عثـــیمین ڕەحمـــەتی خـــوای لێبێـــت لەڕافەیـــدا دەفـــەرمووێ﴿لاَشَـكَ انَّ الـصَّحابة رضـيِ الله عَـنْهُمْ أعْلَـمُ النَّـاسِ كَالخُلَفاء الأربَعـة أَبـي بكـر وعمـر وعثمـان وعلـي ، ولَكِنَ النَقْلُ عَنِ الثَلاثـةِ الأولِين قَلِيل ، لأنَهُمْ مُشْتَغِلوُنَ بالخِلافَةِ وَلأن النَّـاس لَـيْس

---

21 _﴿أصول التفسير﴾لشيخ الاسلام ابن تيمية بشرح الشيخ العلامة ﴿محمد بن صـالح العثيمين﴾

عنْدَهُم جَهل كَثِير بِمعاني القُرآن فَلَيسُوا بِحَاجَةٍ إلى أنْ يُفَسرِوه ، ومِنَ المُشْتَهِرِين أيْضاً عبد الله بن مَسعود وعَبدالله بن عباس .﴾[٢٢]

﴿ بێگومان هاوەڵانی پێغەمبەر ﴿صلى الله عليه وسلم﴾ زیرەکترینی خەڵکن بەڕاڤەی قورئانی پیرۆز بەڵام کۆمەڵێك لەناویاندا بەناوبانگن وەکو چوار خەلیفەکە ڕەزاو ڕەحمەتی خوایان لێبێت بەڵام لەسێ خەلیفەی ئەوەڵ واتە : ئەبو بەکرو عومەرو عوسمان ڕەزاو ڕەحمەتی خوایان لێبێت کەمتر تەفسیریان لێوە وەرگیراوە بەهۆی سەرقاڵیان بە ئیشی خەلافەتەوە خەڵکی لە و سەردەمەدا شارەزابوون لەڕاڤەکردن و زۆر پێویستیان پێ ی نەبوە بەڵام علی کوڕی ابی طالب ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبیت زیاتری لێوە وەرگیراوە و نقڵ کراوە پاشان دوای ئەم خەلیفە بەڕێزانە بەناو بانگەکان عبد الله ی کوڕی مەسعود ، و عبدالله ی کوڕی عەباسە ڕەزاو ڕەحمەتی خوایان لێبێت ﴾

وەبێگومان تابعینیش زۆرن کە بەناو بانگن لەوانە:

﴿ئەهلی مەککە کە شوین کەوتەی ابن عباسن وەکو:( مُجاهِد، وَعِكْرِمة، ،وعَطَاء أبي رَبَاح)﴾

﴿وەئەهلی مەدینە کە ئەتباعی أُبيّ بن كَعْب وەکو:( زَيْد بن أسْلَم، وَأَبي العالية ، وَمحمد بن كعب القُرَظي)

وەئەهلی کوفە : کە ئەتباعی ابن مسعودن وەکو:( قَتَادة، وَعَلْقَمة ، و الشّعبي)

وەبێگومان لەدوای چوار خەلیفەکە ڕەزاو ڕەحمەتی خوایان لێبێت عبد الله کوڕی مەسعود و عبد الله کوڕی عباس ڕەزاو ڕەحمەتی خوایان لێبێت فەزڵێکی تایبەتیان هەیە لە ڕاڤەی قورئانی پیرۆزدا، ابن عباس

---

22 _﴿شرح مقدمة في اصول التفسير﴾ لشيخ الاسلام ابن تيمية ص:٢٢٦

ڕەحمەتی خوا لە خۆی و باوکی بێت پێغەمبەر ﴿صلى الله عليه وسلم ﴾ ئای بەسەنگی پیرۆزی و فەرمووی :﴿ اللَّهُمَّ عَلِّمْهُ الحِكْمَةَ﴾[23]
وەلەرپوایەتێکی تردا ﴿ الكتاب﴾ [24]
هەتا ابو وائل دەفەرموێت :
﴿ خطبنا ابن عباس وهو على المَوسِمِ ( أي والٍ عَلَى مَوسِمِ الَحج من عثمان ﴿رضى الله عنه﴾ ، فافتتَحَ سُورَةَ (النور) فَجَعل يَقْرا ويُفَسِر ، فَجَعلتُ اقولُ : ما رَايْتُ وَلاَ سمِعْتُ كَلامُ رَجُلٍ مِثْلَهُ ولَو سمِعَتْهُ فَارس والرُّومُ والتُرْكُ لأسلمت﴾[25]
واتە: ﴿ ابن عباس (رضي الله عنهما﴾ ووتاری بۆ داین لە وەرزی حەجدا دەفەرموێت : لەسەرەتای سورەتی( النور )دەستی پێ کرد بە خوێندنەوەو ڕاڤەکردنی هەتا ووتم نەمبینیوە و نەم بیستوە نەگوێم لەڕاڤەی وابوە بەو شێوەی کەئەو ڕاڤەی دەکرد دەفەرموێ ئەگەرفارس و ڕۆم و تورك گوێیان لێبوایە مووسڵمان ئەبوون ﴾
وەلەبارەی عبدالله کوڕی مەسعودەوە ئەوەندە بەسە کە پێغەمبەر ﴿ صلى الله عليه وسلم﴾پێ ی فەرموو:﴿ إنَّكَ لَغُلام مُعَلَّم﴾[26]
وەلە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت:﴿ مَنْ أحَب أن يَقْرَأ القُران عضا كما انزل فَلْيَقْرأه عَلىَ قِرَاة أم عبد﴾[27]

---

23 _﴿ البخاري﴾ ( ٣٧٥٦)
24 _﴿متفق عليه﴾ البخاري ( ١٤٣) ومسلم ( ٢٤٧٧).
٢٥_ ﴿اصول التفسير﴾ لشيخ الاسلام ابن تيمية .
26 _﴿إسنادجيد ﴾ المسند (١|٣٧٩).
27 _﴿صحيح. اخرجه احمد (١|٤٤٥|٤٥٤). واسناده حسن ، وعند الحاكم (٣|٣١٧)عن علي ، وعند احمد (١|٢٥|٢٦) عن عمر ، وأنظر النبلاء(١|٤٧٦).

واته:﴿ هەرکەس پێ ی خۆشە قورئان بخوێنێ بەجوانی و ڕێك و پێکی وبیرلێ کردنەوە وەکو چۆن دابەزیوە ئەوا بابخوێنێ لەسەر خوێندنی إم عبد واتا ابن مسعود﴾

وەهە روەها لەریوایەتێکدا ﴿ عَنْ عبدالله بن مسعود ﴿رضی الله عنه﴾ أنَّهُ قَالَ: ﴿ وَمَنْ يَغْلُلْ يَاتِ بِمَا غَلَّ يومَ القِيامَةِ﴾(ال عمران) : ١٦١ ثُمَّ قَالَ: عَلَى قِراءَةِ مَنْ تَأمُرُنِي انْ اقرَا؟ فَلَقَدْ قَرَأتُ عَلَى رسول الله﴿صلى الله عليه وسلم ﴾ بِضْعاً وَسَبْعِينَ سُورةً ، وَلَقَدْ عَلِمَ أصْحَابُ رَسُول الله ﴿صلى الله عليه وسلم﴾ أنِّي أعْلَمهُمْ بِكِتَابِ الله ﴿عزوجل﴾ وَلَو أعْلَمُ أنَّ أحَداً أعْلَمُ مِنِّي لَرَحَلْتُ إلَيْه﴾ قَالَ: شَقِيقٌ : فَجَلَستُ في حَلَقِ أصْحَابِ محمدٍ ﴿صلى الله عليه وسلم﴾ فَمَا سمعْتُ أحداًيَرُدُّ ذَلكَ عَلَيْه وَلاَيَعِيبُهُ﴾ [28]

واتـــــه:﴿لـــــه عبـــــدالله ی کـــــوری مەســــــعودەوە ﴿رضـــی الله عنه﴾کەدەفـەرموێ:﴿ومَـنْ يَغْلُـلْ يَـاتِ بِمَـا غَـلَّ يَـوْمَ القِيَامَـةِ﴾ لەپاشـدا فەرمووی لەسەر (قراءة) ی کێ فەرمانم پێدەکەن بخوێنم بەڕاستی مـن حـەفتاو ئەوەنـدە سـوڕەتم لەخزمـەت پێغەمبـەردا ﴿صلى الله عليه وسلم﴾ خوێنـدەوە ، هـاوەڵانی پێغەمبـەر ﴿ صلى الله عليه وسلم﴾ دەزانـن مـن لـە هـەمویان زانـاترم بەپـەیامی خوایگـەورە﴿جل جلاله﴾ ئەگـەر بمزانیایـە کەسـێ تـر هەیـە زانـاتر لـەمن بارگـەم دەبەسـت بـۆلای ،(شـقیق) دەڵـێ:﴿دانیـشتوم لەئەڵقـەکانی هـاوەڵانی محمـد﴿صلى الله عليه وسلم﴾ نەمبیستوە کەسێك بەرپەچی ئەم قسەیەی بداتەوە ، یان نا تەواوی تیا بدۆزێتەوە﴾

---

28 _﴿صحيح مسلم﴾ ١٦٢١~﴿بخاری| فضائل القرآن ~٤٧١٤.

وەهــەروەها لەریوایــەتێکی تردادەفــەرمووێ:﴿وَالّـذي لَاالـه الا غَيْـرهُ مَانْزِلَتْ آيـة مِنْ كِتَابِ الله إلاّ وانَـا اعْلَمُ فِيمَا نَزَلَتْ وايـنَ نَزَلَتْ وَلَـوْ اعْلَمُ مَكانَ احدٍ اعلمَ بكِتابِ الله مِني تنالُهُ المَطَايَا لأتيْتَهُ﴾

ســوێند دەخــوات ودەفــەرموێ:﴿ ســوێند بــەو خوایــەی جگــە لــەو پەرستراوی بەحەق نیە هیچ ئایەتێك لەقورئانەکەی خوا ﴿جل جلاله﴾ دانەبــەزیوە تــەنها زانیومــە لــە سەرچــی دابــەزیوەو لــەکوێ دابــەزیوە وەئەگەر بـزانم کەسێ هەیـە لەشـوێنێ شـارەزاترە بـەقورئانی خـوا﴿جل جلاله﴾ لەمن ئەوا ووشتر بیگاتێ ئەیگەمێ ﴾

بێگومان ئەم هاوەلاّنە زۆر دورن لەوەی تەزکیەی نەفسی خۆیـان بکـەن بـەڵکو مەبەسـتی ئەوەیـە کـەزانیاری و زانـستی لایـەو خـەڵکی شـتی لێ وەربگرن و لێی سودمەند بن والله اعلم.

## ﴿قەدەغە کردنی گۆرانیی و مۆسیقا لەژێر ڕۆشنایی قورئانی پیرۆزدا﴾

بەپــشتیوانی خــوای تعــالی﴿جل جلالـه﴾ بــۆ هــەموو مووســڵمانێکی بەرێزو خوێنەرێ دەنوسم کەسەرەتا دەبێت بزانین و بیروڕامان دەبێـت وابێــت کەهەرشــتێ خــوای تعــالی ﴿جـل جلالـه﴾ کردبێتیــە شــەرع بــۆ بەندەکانی هەر لەفەرمان کـردن و ڕێگـرتن و بـەڕەوا دانـانی حیکمـەتی گەورەی تێدایە جاحەلاڵ کردنی بێت یان حەڕام کردنی وەهیچ شـتێك بـێ حیکمـەت نیـە جـا ئەوانـەی ڕۆشـنە لامـان دەزانـرێ و دەیـزانین وەئەوەی ڕۆشن نیە لامان و نایزانین ئەوا نایزانین وەلای هەندێ هەیـە ئاشـکراو ڕوونـە وەلای هەنـدێکی تـر شـاراوەو وونـە ، بۆیـە پێویـستە لەســەر هــەموو مووســڵمانێك کــە بەتــەواوی گــوێ ڕایــەڵی خــوای

پەروەردگار بێت وەمل کەچی فەرمانەکان و نەهیەکانی بێت هەروەکو دەفەرموێ:﴿ فَلا وَرَبِّك لايُؤمِنُونَ حَتَّى يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لايَجِدُواْ فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجاً مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسْلِيماً﴾ [٢٩]

واتە:﴿ نەخێر وانیە کەخۆیان بەباوەڕدار نیشان دەدەن سوێند بە پەروەردگارت بڕوادار نین تا تۆ نەکەنە دادوەر لەهەر ئاژاوەو دووبەرەکیەکی نێوانیاندا لەپاشان هەست نەکەن لە دەرونیاندا بەهیچ بێزاریەك لەو بڕیارەی تۆ داوتە وەمل کەچ نەکەن بەملکەچی یەکی تەواو﴾

پاشانیش لەسەر مووسڵمانانیش پێویستە بەگوێرەی توانای خۆیان بگەڕێن بەدوای حیکمەت یان عیلەت وەپاڵ نەدەنەوە لەقەلە قی و بێزاریدا بژین بۆیە ئەگەر پرسیار کەرێك بپرسێ و بەو زانا بەڕێزانە بڵێ کە مۆسیقاو گۆرانی و دەهۆڵ و زووڕنا ....هتد بە حەلاڵ دەزانن حیکمەت لە حەلاڵ کردنی مۆسیقاو گۆرانی چیە؟؟؟!!!!!

بێگومان ناتوانرێ وەلامێکی وا بدرێتەوە کەدڵ ئارام بکات و قەناعەت بە مووسڵمانی بە ویژدان بکات "

پاشان ئەگەر کەسێ بڵێ باشە ئەی حیکمەت لە حەرام کردنی مۆسیقاو گۆرانی چی یە؟

بەپشتیوانی خوای تعالی ﴿جل جلاله﴾ ئێمە دەڵێین بەڵێ هەم بەدەقی قورئانی پیرۆز هەم بەفەرموودەی صەحیحی پێغەمبەر﴿صلی الله علیه وسلم﴾ وەهەم بەفەرموودەی تابیعین و زانایان ، وە حیکمەت لەحەرام بوونی مۆسیقاو گۆرانی ئەوەیە کەمووسڵمانان دوور ئەخاتەوە لە زیکری خوا ﴿جل جلاله﴾ وە دوور کەوتنەوەیە لە واجبە شەرعیەکان

---

29 _﴿ النساء﴾الایة ٦٥

بێگومان دڵێ وەرگری مۆسیقاو گۆرانی بێت چۆن قورئـانی تیـادا جێ دەبێتەوە؟!!

شیخ الالبانی ڕەحمەتی خوای لێبێت دەفەرمووێ:﴿قد كنت في المسجد يـوم الجمعـة أسـتمع الى الخطبـة وبجـانبي شـاب في نحـو ثلاثـين مـن العمر وقد جلس متربعا وهـو يطقطق بأصـابعه علـى الارض كمـا لـو كان يـسمع أغنيـة فهـو يـرقص أصـابعه معهـا وأشـرت اليـه بالإمتنـاع والاستماع للخطبة﴾[30]

واتــە:﴿دەفــەرمووێ لەمزگــەوت بــووم ڕۆژی هــەینی گــوێم لــە ووتــار دەگرت وەگەنجێ لەپەناما بوو تەمەنی لەدەوری سی ساڵان دەبوو چوار مشقی دانیشتبوو پەنجەكانی یـەك لـەدوای یـەك دەدا بـەزەوی دا وەكـو ئەوەی كە گوێ ی لە گۆرانی گرتووە پەنجەكانی دەجولاند لەگەڵیـدا !!! دەفەرمووێ منـیش ئیشارەتم بۆ كـرد كـەوا نـەكات و گـوێ لـە ووتارەكـە بگرێت﴾

شیخ الالبانی دەفەرمووێ:﴿ووتم بەڕاسـتی إبـن القـیم ڕەحمـەتی خـوای لێبێـت ڕاسـت دەكـات كەدەفـەرمووێ كاریگـەری و بەرهـەمی ئەوانـەی كەئالودەی مۆسیقاو گۆرانی و.....هتـد بـون تیایانـدا دەر دەكـەوێت بـە ڕواڵـەت و بیـنین واتـە كاریگـەری و شـوێنەواری لەسـەر ئەوانـە دیاریـە بۆیـــە دەفـــەرمووێ ئـــا ئەوانـــەش و نموونـــەی ئەوانـــەش بەڵگـــەن لەسەرئەوەی كەڕێگری مرۆڤ دەكەن لـەزیكرو یـادی خـوا﴿جل جلاله﴾ وە ڕاستی ڕافەی لهو الحديث دەردەخەن.

---

30 _﴿تحريم الات الطرب﴾لشيخ محمد ناصر الدين الالباني.

خوێنـەری بـەڕێز:﴿ابـن القـيم ڕەحمـەتی خـوای لێبێـت چـەند ئـاوازو بیـــستنێکی شــەیتانی بــاس دەکــات و ناوەکانیــان دیــاری دەکــات و دەفەرمووێ:

﴿اللـهو~ اللغـو~ الـزور~ المكـاء~ التـصدية~ رقيـة الزنـا~ منبـت النفـاق في القلـب~ الـصوت الاحمـق~ الـصوت الفـاجر~ صـوت الشيطان~ مزمار الشيطان~ السمود﴾[31]

بێگومان هەر ناوەکانیـان دەلالـەت دەکات لەسـەر وەصفیان و خراپیان وەکوو دەفەرمووێ:

أسماؤه دلَتْ علَى أوُصَافه      تَبًا لذي ألاسْمَاءِ وَالاوصَاف

کەواتە بابچینە خزمەت قورئانی پیرۆز تا بزانین چۆن باسی حەرامی مۆسیقا وگۆرانیمان بۆ دەکات"

سەرەتا بە پشتیوانی خوای تعالی ﴿جل جلاله﴾ نـاوی ﴿لهو الحديث﴾باس دەکـەین و ڕاڤـەی دەکـەین ، لـەقورئانی پـیرۆزدا ، خـوای تعـالی ﴿جـل جلاله﴾دەفەرمووێ:

﴿ومنَ النَّـاسِ منْ يَشْتَرِي لَهُو الحديثِ ليُضلَّ عَنْ سبيلِ الله بِغَيْرِ علْمٍ وَيَتَّخذَهَا هُزُوَاً أُوْلآئك لَهُمْ عَذَابٌ مُهِينٌ﴾[32]

واتە:﴿هەندێ لە خەڵکی هەیە قسەو باسی بێهودە دەکات بۆ ئەوەی بـە نەزانی خەڵك لە ڕێگەی خوا ﴿جل جلاله﴾ گومڕا بکـات وەڕێگـەی خـوا ﴿ جـل جلالـه﴾ دەکاتــە جێگــەی گاڵتــەو لاقرتــێ ، ئـا ئەوانــە ســزای ڕیسواکەریان بۆ هەیە﴾

---

31 _﴿إغاثة اللهفان من مصايد الشيطان﴾ابن القيم

32 ـ﴿سوره لقمان﴾ الايه ٦

ئەو بەڵگانەی کە ﴿لهو الحديث﴾لەئایەتەکەدا بە گۆرانی و هاوشێوەی دەزانن تەرجومانی قورئان (عبد الله کوڕی عباس)ە ڕەزاو ڕەحمەتی خوا لە خۆی و باوکی بێت دەفەرمووێ: ﴿نَزَلَتْ فِي الغِنَاءِ وَأَشْبَاهِهِ﴾[33]

واتە: ﴿دابەزیوە لەسەر گۆرانی و هاوشێوەکانی وەکو مۆسیقاو........هتد﴾

وەدووەمیان : عبد الله کوڕی مسعود ﴿رضی الله عنه﴾ پرسیاریان لێکرد سەبارەت بەو ئایەتە پیرۆزە فەرمووی:﴿ هُو الغِنَاء وَالَّذي لاَ الَهَ إلاَ هُوْ يُرَدِّدُهَا ثَلاَثَ مَرَات﴾[34]

واتە:﴿ سێ جار سوێندی خوارد کەمەبەست بە گۆرانیە﴾

وەسێیەمیان:( عکرمە﴾ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێت :﴿ قال شُعَيب بن يَسار سَألتُ عِكْرِمَةَ عَن لَهو الحدِيثِ؟قالَ:﴿هُو الغِنَاء﴾[35]

واتە:﴿شوعەیبی کوڕی یەسار دەفەرمووێت : پرسیارم لە عکرمە کرد لە ﴿لهو الحديث﴾ فەرمووی ﴿ئەوە گۆرانیە﴾

---

33 _اخرجه البخاري في الادب المفرد١٢٦٥، وابن ابي شيبة ٣١٠/٦ ، وابن جرير في التفسير ٤٠/٢١، وابن ابى الدنيا في ذم الملاهي ، والبيهقي في السنن ١٠/ ٢٢١/ ٢٢٣ من طريقة عنه.

34 _اخرجه ابن أبي شيبة ، وابن جرير ، وابن أبي دنيا ، والحاكم ٢/ ٤١١ ، والبيهقي في الشعب الايمان ٥٠٩٦/٢٧٨/٤، وابن الجوزي في تلبيس ابليس ص/٤٦، وقال الحاكم صحيح الاسناد ووافقه الذهبي وصححه ابن القيم.

35 _اخرجه البخاري في التاريخ ٢/ ٢١٧) ، وابن جرير ايضاً ، وابن ابي شيبة وابن ابي الدنيا وللفظ له~ ومن طريقة البيهقي ورجاله ثقات ، وابن حبان ٤/ ٣٥٥) فهو حسن الاسناد ولاسيما وقد تابعه اسامة بن زيد وهو ﴿الليث﴾ هنا وهو حسن الحديث فبهذه المتابعة القوية صح الاثر والحمد لله

وەلەڕیوایەتێکـــــدا ابـــــن جریـــــر لەڕێگـــــەی مجاهـــــد دەفەرمووێ:﴿اللهو﴾:﴿الطبل﴾[36]

وەهــەروەها شــێخ حەســەنی بەصــری وە ســعیدی کــوڕی جوبــەیر وەسەعیدی کوڕی موسەیەب .......... وەچەند تابیعیەکی تریش﴾

بۆیــە ﴿الواحــدی﴾دەفــەرمووێ:﴿اكثـر المفَـسِّرينَ عَلَـى أنَّ المُـرَادَ ب (لَهْوَ الَحديث)الِغنَاء﴾ وَقَالَ اهْل المَعَـاني :﴿ ويَـدْخُلُ في هَـذا كُلُ مَـنْ اخْتَار اللَهْوَ وَالغِناء وَالَمزاميروالمَعَازِف عَلَى القُرآن﴾[37]

﴿زۆرینەی ڕاڤە کەرانی قوڕئانی پـیرۆز لەسـەر ئـەوەن کـە لهوالحـدیث مانای گۆرانیە﴾وە ئەهلی مەعانیش دەڵێن دەچێتە ئەو بابـەوە هـەموو ئەوانەی کەهەڵگری اللهون وەکو شمشاڵ و زووڕناو کەمان و .....هتد﴾

پاشان ئەگەر ورد ببینەوە لـە ووشـەی الاشتراء بـە مانـای (الاسـتبدال والاختیـار)ە وەلەگەڵ تێبینیـەکی گـرنگ لەسـەر لامـی ~لیضل~ ئـەم لامە لامـی العاقبەیـە نـەك لامـی تعلیـل وەکـو لـە تەفـسیری الواحـدی دا هـاتوە بـەمانای ﴿لیـصیر امره الی الـضلال﴾ هـەروەکو ابـن جـوزی لـە (زاد) دەفەرمووێ (٣١٧/٦)واتەهەرچی ئەو کـارە بکـات سـەرئەنجامەکەی گومڕابوون و سـەر لێشێواویە ، لێـرەدا هەنـدێ گرفـت دێنـە پـێش لـەم ئایەتەدا کەبێگومان گرفتی تێدانیە بەڵکو گرفتەکە لەو کەسانەدایە کە بـوێری دەنـوێنن و حـوکمی ئایەتەکـە لادەدەن لـە ڕاڕەوی خـۆی بـە تەئویل و نەزانین !!

36 _(رجاله كلهم ثقات فهو صحيح ان كان ابن جرير سمعه من مجاهد ) قال شيخ الالباني في تحريم الات والطرب ص ١٤٤.

37 _تفسير (الوسيط) للواحديّ ٣/ ٤٤١.

بێگومـان ئەمـەش لەبـەر خـاتری سەرخـستنی بۆچـونی هەنـدێ کـەس بــەڵام والله تــێ نەگەیـشتنیان لــە ئایــەتی خــوای تعــالی ﴿جـل جلالـه﴾ دەردەخات بەڵام هەرکەسێ کە دڵی مردبـێ فیتنـەی شـەهەوات لەدڵیـدا گەورە بوبێ بێگومان ڕێگری لێ دەکرێ بـۆ وەر گرتنـی حـەق و ڕاسـتی

﴿وَمَنْ يُرِدِ اللّهُ فِتْنَةً فَلَنْ تَمْلِكَ لَهُ مِنَ اللّهِ شَيْئاً أُولَئِكَ الَّذِينَ لَمْ يُرِدِ اللّهُ أَنْ يُطَهِّـرَ قُلُـوبَهُمْ لَهُـمْ فِي الـدُّنيَا خِـزْيٌ وَلَهُـم فِي الأَخِـرَةِ عَـذَابٌ عَظِيمٌ﴾[38]

جا سێ خاڵ باس دەکەن بۆ لادان لەو حوکمەی کەلە ئایەتە پیرۆزەکەدا هاتوە:

١-﴿ أنّه لاَ حُجةَ لأحدٍ دُونَ رَسُول الله ﴿صلى الله عليه وسلم﴾.

2_﴿انه قَدْ خَالَف غَيْرُهُم مِنَ الصَّحابَةِ والتَّابعِين﴾

٣-﴿أنَ نَص الايَـة يُبْطِل احْتِجَاجِهم بِهَا ؟ لأن فِيهَا ﴿ ومـن النـاس مـن يـشترى لهـو الحـديث ليـضل عـن سـبيل الله بغير علـم ويتخـذها هـزوا اولئـك لهـم عـذاب مهـين﴾وهَـذِهِ صِـفَة مَـنْ فَعَلَهَا كَانَ كَافِراً بِلاَ خِلاَف اذا اتَخَذَ سَبِيلِ الله تعالى هُزوا...﴾

لەوەڵامدا بۆ ڕەواندنەوەی ئەو بۆ چونە هەڵەیە دەڵێین :

١ـ کاتێ دەڵێ هیچ کەس نابێتە بەڵگە جگە لە پێغەمبەری خوا ﴿صلى الله عليه وسلم﴾ دەڵـێین ﴿کلمـة حـق اریـد بهـا باطـل﴾لەبــەر ئــەوەی بــە بۆچوونی خۆی وا دەزانێ ئەم ئایەتە پیرۆزە پێچەوانەی ئـەو ڕاڤەیەیـە کەلەپێغەمبەری خواوە ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ هاتووە کە هـەرگیز شـتی وا نەبووە و نابێ !!!!!ئەگینا چۆن عبدالله ی کوڕی مسعود سێ جار سوێند دەخوات !!!!

---

38 _﴿ سورة المائدة ﴾ الاية ٤١.

وەهیچ هاوەڵێکیش دژایەتی لەگەڵ ئەم ڕافەیەدا نەبووە بەس تەنها پێچەوانەی ئەو ڕافە ووشکەیە کە ابن حزم و هاوڕاکانی دەیکەن بۆیە هەڵەو نەپێکانی ابن وحزم و هاوڕاکانی زۆر بەرۆشنی دیارە ..

وەبێگومان بۆچون و ڕافەی هاوەڵان لە لایەکەو ابن حزم و هاوڕاکانی لە لایەکی تر .

٢_کە دەڵێن پێچەوانەی ئەو ڕافەیەن چ لەهاوەڵان و چ لە تابعین !!- دەڵێین باشە ئەگەر پێچەوانەی هاوەڵان هەیە لەسەر ئەو ڕافەیە ناوی دووهاوەڵی پێغەمبەر ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾بێنن کە فەرموو بێتیان مەبەست گۆرانی و مۆسیقا نیە ؟؟!!بێگومان هیچ هاوەڵێك شتی وای نەوتووە وەزۆرێ لە تابیعینیش هەر ئەو بۆچونەیان هەیە وە ئەگەر کەمێ لەتابیعین هەبن ئەوا فەرموودەی هاوەڵان پێش دەخرێت وەکو پێشتر ڕوونم کردەوە لە باسی پێش چوونە ناو ڕافەی قورئانی پیرۆز ، پاشان ئەگەر کۆمەڵێ لە تابیعین بۆچونیان وابێت کە مەبەست گۆرانی و مۆسیقا نییە ئەوا قسەی هاوەڵان پێش دەخرێت بەتایبەت ﴿عبد الله ی کوڕی مسعود ﴾و ﴿ ابن عباس ﴾ وە لەگەڵ ئەوەشدا زۆرێ لە تابیعینیش بۆ چونیان وایە کەمەبەست گۆرانی و مۆسیقایە دەی بۆ هەمیشە ڕای پەسەند و ڕاجح وەرنەگرین کەبێگومان باشترە وە لەگەڵ ئەوەشدا کە فەرموودەی هاوەڵان پێش دەخرێت لە ﴿تەفسیر و حدیث و فقهدا﴾.

کە دەڵێ :﴿أنَّ النص الاية.........﴾

٣-دەڵێت دەقی ئایەتە کە خۆی ئەو بەڵگا نە بەتاڵ دەکاتەوە چونکە لە ئایەتەکەدا هاتووە ﴿ومن الناس........﴾ کە ئەمە سیفەتێکە هەرچی بیکات کافرە بەبێ جیاوازی ئەگەر دینی خوای گەورە بەلاقرتێ بگرێ

دەڵێین ابن القيم ( ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێت ) دەفەرموێت ﴿ئایا نابینن کەهەندێ کەس لە مووسڵمانان لەم سەردەمەدا لهو دەکەن لە دانیشتنیان لە ئاهەنگەکانیان بەقسەی دونیایی وەجگەرە کێشان و تاوڵەو قومار ....﴾ لەکاتێکدا دەبیستین کەخوای گەورە ﴿جل جلاله﴾ دەفەرمووێ ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ ءامَنُوا إِنَّمَا الخَمْرُ وَالمَيْسِرُ وَالانْصَابِ وَالأَزْلاَمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوُه لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾[٣٩] دەی لە کاتێکدا کەگوێ بیستی ئەو ئایەتەو چەند ئایەتێکی پیرۆزی تر دەبن کەچی ئەوان هەر لەسەر قسەی لهو و سەرسامی خۆیانن هەروەکو ئەوەی کە گوێیان خنرابێت وگیرابێ ئایا ئەوانە کافرن ؟؟ ئەی ابن حزم وهاوڕاکانی !!! بەڵکو ئەو مەوقیفە کەبەو جۆرەیە قەولی ابن عەباسمان ﴿رضی الله عنهما﴾بیر دەخاتەوە کە دەفەرمووێ:﴿کفر دون کفر ﴾ خۆهەموو کفرێ خاوەنەکەی لە میلە دەرناکات بۆیە هەموو نموونەی ئەوانە بەشێکیان هەیە پشکێکیان هەیە لەو زەم و سزایەدا جاهەرکەس بە ئەندازەی خۆی بەردەکەوێ هەروەها ابن العطية دەفەرموێ:﴿ والاية باقية المعنى في امة محمد ﴿صلى الله عليه وسلم﴾ولكن ليضلوا عن سبيل الله بكفر ولا يتخذوا الآيات هزوا، ولا عليهم هذا الوعيد بل ليعطل عبادة ويقطع زمانا بمكروه وليكون من جملة العصاة والنفوس الناقصة﴾[٤٠] کەواتە ئەوانەی شارەزای بواری تەفسیرن بۆچونیان وایە کە لهو الحدیث لە ئایە تە کەدا مەبەست گۆرانی و مۆسیقایە ....دەی کەواتە بۆچی ئێمە ڕای پەسەندو چاك وەرنەگرین لە ووتەی هاوەڵانی بەرێزی پێغەمبەر ﴿صلی

---

39 _﴿ المائدة﴾ الاية ٩٠

40 _﴿ تفسير (المحرر الوجيز) لعلامة ابن عطية الأندلسيّ (١٣/ ٩).

الله عليه وسلم ﴾ ؟!!!!!! بۆچی تەئویلات و پینەو پەڕۆ بێنینەوەو وەرگرتنی لەسەر دڵمان قورس بێت لە کاتێکدا کەپینەو پەڕۆکردنی ڕاو بۆچونەکان سوود و قازانجی تیادا نیە نەلەبواری دەعوەو بانگەواز نەلەبواری لایەنی ڕۆحی !!! بەڵکو گومان نی یە لەوەدا کە گۆرانی و مۆسیقا ڕێگرە لەبەردەم تێگەیشتنی مرۆڤ لە قورئانی پیرۆزو ئیش پێکردنی بۆیە دەڵێم شارەزای بواری خۆی ڕاستی ووتوە کەدەڵێ:

| | |
|---|---|
| أتَذْكُرُ لَيْلَةً وَقَدْ إجْتَمَعْنَا | عَلَى طِيبِ السَّمَاعِ إلى الصَّبَاحِ |
| وَدَارَتْ بَيْنَنَا كَأسُ الاغَانِي | فَأسْكَرَتِ النُّفُوس بِغَيرِ رَاحِ |
| فَلَمْ تَرَى فِيهِم إلا نَشَاوَى | سُرُوراً وَالسُّرُورُ هُنَاك صَاحِي |
| إذاَ نَادَى أخُو الَّلذَاتِ فِيه | أجَاب الَّلهوَ:حَيَّ عَلَى السَماح |

ئایەتی دووەم : خوای تعالی ﴿جل جلالە﴾ دەفەرموێت :﴿وَقُلْ جَاءَ الحَقُّ وَزَهَقَ البَاطِلُ إنَّ البَاطِلَ كَانَ زَهُوقًا﴾[41]

واتە:﴿ وەبڵێ ئاینی ڕاست و هەق هات وە ئاینی ناهەق و بەتاڵ نەماو ڕۆیشت بە ڕاستی بەتاڵ هەمیشە لە ناو چووە﴾ جا ابن القیم دەفەرموێ:﴿ بەتاڵ بەمانای هەر بوونی نیە ، یان بوونی هەیە بەلاّم هیچ سوودی نیە جا بەتاڵ وەسف دەکات بە مانای ﴿الكفر~ الفسوق~ العصيان~ السحر~الغناء~ استماع الملاهي﴾[42]، بۆیە پیاوێك لە ابن عباس ی پرسی ﴿رض الله عنهما﴾ ﴿ مَاتَقول فِي الغِنَاء " حَلَالٌ هُو أمْ حَرَام" فَقَالَ : لاأقُولُ حَرَاماً إلامَافِي كِتَابِ الله ، فَقَالَ أفَحَلالٌ هُو؟ فَقَالَ وَلاَ اقُولُ ذَلِك ،ثُمَّ قَالَ لَهُ  أرَأيْتَ الحَقَ وَالبَاطِلَ إذَا جَاءَ يَوْمَ

---

41.﴿الاسراء﴾الاية ٨٠ ~٨١ .

42.﴿اغاثة اللهفان من مصايد الشيطان﴾ ابن القيم .

القِيَامَـة فأيْنَ يَكُـونُ الغِنَـاء ؟ فَقَالَ الرَّجُل يَكُـون مَـعَ البَاطِـل ، فَقَـالَ إذهَبْ فَقَدْ افْتَيتَ نَفْسَك﴾

واتە: ﴿ پیاوێك پرسیاری كـرد لـه ابـن عبـاس و فـەرمووی چـی دەڵێـی دەربارەی گۆرانی ؟! ئایا حەلاڵە یان حەرامە ؟ فەرمووی ناڵێم حەرامـە تـەنها مەگـەر لـە قورئـانی خـوای گـەورەدا بێـت كـابرا ووتـی ئـەی ئایـا حەلاڵە ؟ فەرمووی شـتی واش نـاڵێم ، پاشـان ابـن عبـاس پێـی فـەرموو دەبینی كەحەق و ڕاستی وە باتڵ و ناڕاست كاتێ دێ لـەڕۆژی قیامـەتـدا گۆرانی لـە كوێیاندایـە واتـە لـە حـەق یـان بـەتاڵ؟ كـابرا ووتـی لەگـەڵ بەتاڵدایە ابن عباس فەرمووی : كەواتە بڕۆ خۆت فەتوات بـۆ خـۆت دا. ئەوە وەلامی ابن عباس ڕەزاو ڕەحمەتی خوا لە خۆی و بـاوكی بێـت كـە بێگومان لەو سەردەمەدا ئەو گۆرانیـەی كـە ئـەوان پرسـیاریان لێكـردوە پیا هەڵدانی تێدا نەبوە بەسـەر ﴿شـەراب و ئـافرە ت و .......هتـد﴾ وە ئەم ئالە تانەی كەدڵی مرۆڤ ئەخاتە ڕەقس و سەما لەو سەردەمەدا بەم ئەندازەی ئێستا نـەبووە بۆیـە ئەگـەر ابـن عبـاس ڕەزاو ڕەحمـەتی خـوا لەخۆی و باوكی بێت لەم سەردەمەدا بوایە چی دەوت ؟؟!!!

ئایـــەتی ســـێ یـــەم: لەســـەر بەڵگـــەی حـــەڕام بـــوونی مۆســـیقاو گۆرانی......هتد.

خوای تعالی ﴿جل جلاله﴾دەفـەرموویت:﴿ وَالَّذِينَ لايَشْهَدُونَ الزُّور وَإذَا مَرُّواْ بِاللَّغْوِ مَرُّواْ كِرَاماً ﴾[43]

واتە:﴿ بەنـدەكانی خوا﴿جل جلاله﴾كەسـانێكن كـە شـایەتی درۆ نـادەن وە كـاتێ تێپـەڕ دەبـن بـە لای شـتی بـێ كـەڵك و بـێ سـوودا واتـە ئـەنجام

43ـ﴿الفرقان ﴾ الاية ٧٢

بـدرێت لەلایـەن موشـریكەكان ونەفامەكانـەوە تێپـەڕ دەكـەن و دەڕۆن بەڕێزەوە بێ گوێ دانە ئەو نەفامانە﴾.

محمدی كوڕی الحنیفـە دەفـەرموێ : الـزور هنـا :الغنـاء واتـە مەبەسـت گۆرانیـە ﴾ دەفـەرموێت ﴿لایحـضرون مجـالس الباطـل﴾.واتــە:﴿ ئامـــــادەی كـــــۆڕو كۆبونـــــەوەكانی باتـــــڵ نـــــابن﴾ وەووشەی اللغو لە زمانەوانیدا واتـای ﴿كل مـایلغی ویطـرح﴾وە مانـای﴿ لایحضرون مجالس الباطـل ﴾ واتـە: ئامـادەی كـۆڕە بـە تاڵـەكان نـابن كـاتێ كەبەلایانـدا تێدەپـەڕن وە ڕێـزی خۆیـان دەگـرن لـەوەی لـەلایان بوەسـتن واتـە ناوەسـتن و دڵیـان بەلایانـدا لێ نـادات دیـارە موشـریك و نەفامـەكان لـە جەژنەكانیانـدا گاڵـە گـاڵ و بـەزم و ڕەزم و گـۆرانی و مۆسیقا .....هتد ﴾ تێدابوە هەروەكو سەلەف ڕەحمەتی خوایـان لێبێـت ڕاڤـەیان كـردوە دەی ئەمانـە بـەڕێزەوە بەلایانـدا تێپـەڕیون و لایـان لێنەكردونەتەوە ﴿الزجاج﴾ دەفەرمووێ﴿ لایجالـسون أهل المعاصـی ، ولایمالئونهم علیها ، ومروا مر الكرام الذین لایرضون باللغو،لأنهم یكرمون أنفسهم عن الدخول فیـه وَالاختلاط باهلـه﴾واتـە:﴿دانانیـشن لای خەڵكی گوناهكار وەدڵ و حەزیان لێنادات بۆیان ، وە تێدەپـەڕن بـە تێپەڕبوونێكی بەڕێز تێپەڕبوونێ كەڕازی نابێ بـە اللغـو لەبـەر ئـەوەی ئەوان ڕێزی خۆیان ئەگرن لە چونە ناویان و تێكەڵ بوونیان﴾..

وە خوای گەورە ﴿جل جلاله﴾ وەسف و سەنای ئەوانـە دەكـات كەپـشت لـە لغو دەكەن كـاتێ گوێیـان لێ دەبێـت وەكوو دەفـەرمووێ:﴿ وَإِذَا سَمِعُواْ اللَّغْوَ اعْرَضُواْ عَنـهُ وَقَالُواْ لَنَـا اعْمَالُنَـا وَلَكُمْ اعْمَـالُكُمْ سَلاَمٌ عَلَيْكُمْ لانَبْتَغِي الجَاهِلِينَ ﴾[44]

---

44 _ ﴿القصص﴾ الایة ٥٥

واتـه : ﴿ كـاتێ قـسەی ناپەسـەندو هـیچ دەبیـستن پـشتی تێدەكـەن و دەڵـێن بـه نـه فامـان ئـەنجامی كردەوەكانمـان بـۆ خۆمانـەو ئـەنجامی كردەوەكانی ئێـوەش بـۆ خۆتانـە سـەلامی جیابوونـەوەتان لێبێـت ئێمـە هاوڕێیەتی و تێكەڵی نەفامانمان ناوێ﴾...

جاهەر چەندە هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە تایبەتـە ،بـەلآم مانـای گشتیە هەموو ئەوانە دەگرێتەوە كە خۆیان لە لهو ولغو بەدوور دەگرن ودەڵێن ﴿ لنا اعمالناولكم اعمالكم﴾

جائەگەر وورد ببینەوە لەو ئایەتـە پیرۆزەی خـوای گـەورە ﴿جل جلالـه﴾ كە دەفەرمووێ:﴿ لایشهدون الـزور﴾ نـەی فـەرمووە ﴿بـالزور﴾لەبـەر ئەوەی ﴿یشهدون﴾ بـەمانای ﴿یحـضرون﴾جـا خـوای گـەورە وەسـفیان دەكـات بـەوەی كـە ئامـادەی دانیـشتن و مەجلیـسی ﴿الـزور﴾نـابن وە بێگومـان ئەگـەر لـە كـەلام و قـسەو كاریـان بەشـدار بـێ توشـی گونـاه و تاوان دەبێ خۆ گوناه و تاوانبار بونیش بۆ شتی حەڕامە واتە لە شـتی حەڕامدایـە ، وەگومـان نییـە لـەوەدا كـە مۆسـیقا و گـۆرانی گـەورەترین ﴿الزور﴾ن.

بۆیـە ئـەو كەسانەی كـە بـیرو بـۆ چـونیان وایـە كـە مۆسـیقا و گـۆرانی حەلآڵـە بالـە ئایـەتی خـوای گـەورە ﴿جـل جلالـه﴾ وورد ببنـەوە وە لـە فـەرموودەی صـەحیحی پێغەمبـەر ﴿صـلى الله علیـه وسـلم ﴾ ووردببنـەوە چونكە ڕۆژێ لەپێشماندایە كەهەمووومان بەرەو ڕوی دەڕۆین و تۆمـاری قسەو كارو نووسین و.......هتد مان لای خوای تعالى ﴿جل جلاله ﴾تۆمـارە وەدەبـێ ئـەوەش بـزانین ئـەم دینـە ئەمانەتـە نـابێ بـە بـێ زانیـاری بیـشێوێنین ، وە بـۆ دەبێـت دەهـۆڵ و زوورنـا شمـشاڵ و ...هتـد بـۆ نـا مووسڵمان حەڕام بێت بەلآم بۆ حیزبە ئیسلامیەكان حـەلآڵ بێـت؟!!!!!

فەرق و جیاوازی ئەو ئامێرانەی نا مووسـڵمان بـەكاری دێنێـت لـە گـەڵ

ئەو ئامێرانەی مووسڵمانان بەکاری دێنن چیە؟!!!!!بێگومان چۆن ئەو ئامێرانەی دڵ و هەستی مرۆڤ دەهەژێنێت کە کەسێکی نامووسڵمان بەکاری دێنێت ئاوەهاش مرۆڤ لە فیترەتی پاکی دەردەچێت ئەگەر گوێبیستی ببێ با حیزبی ئیسلامیش لێی بدات و بەکاری بهێنێ!!!!!!
چۆن شێخ البانی ڕەحمەتی خوای لێبێت باسی ئەو گەنجەی کرد وەالله منیش لە مزگەوتێ لە مزگەوتەکانی شاری سلێمانی دانیشتبووم کۆمەڵێ گەنج هاتن سروودیان دەوت یەکێك لەو برایانەی سروودەکەی دەووت لە پێشی ئەوانی ترەوە بوو ئەوانی تر لەدوایەوە ئەیان ووتەوە دەفێکی بەدەستەوە بوو لێی دەدا برادەرێکم لە تەنیشتم بوو پێی ووتم (سەیری قاچی کە چی لێدەکات ﴾واللە سەیری قاچیم کرد خێرا خێرا ئەیدا بە زەویدا هەروەکوو ئەوەی گۆرانی بڵێ بە حسابی خۆی سروودی ئیسلامی دەووت!!!...

| | |
|---|---|
| واحذر مناقشة الحساب فإنه | لابد يحصى ما جنيت ويكتب |
| لم ينسه الملكان حين نسيته | بل اثبتاه وانت لاه تلعب |

ئایەتی چوارەم: لەسەر بەڵگەی حەرام بوونی مۆسیقاو گۆرانی خوای تعالی ﴿جل جلاله﴾ دەفەرمووێ:﴿أفَمِنْ هَـذَا الْحَـدِيثِ تَعْجَبُـونَ* وَتَضْحَكُونَ وَلَا تَبْكُونَ * وَأَنْتُمْ سَامِدُونَ ﴾[45]
واتە: ﴿جا ئێوە لەم ووتەیە کە قورئانی پیرۆزە سەرتان سوڕدەمێنێ؟!وە پێدەکەنن و ناگرین !! وەئێوە سەرسام و سەرگەرم و بێ ئاگان﴾

45 ﴿ النجم ﴾ الايه ٥٩ ~٦١

ابـن عبـاس ﴿رضـی الله عنهما﴾دەفـەرموویّت : ﴿ أنـتم سـامدون﴾ : ﴿هـو الغناء وهي يمانية : يقولون :اسمد لنا : تغنّ لنا ﴾وفي الروايـة عن ابـن عبـاس ﴿ رضـی الله عنهما ﴾ قـال ﴿الـسامدون : المغنـون بلحميريـة ﴾وقال عكرمة والضحاك :﴿ السمود: اللهو واللعب ﴾[٤٦]
واتە: ﴿بریتیە لە گۆرانی بە یەمانی وەدەڵێن اسمد لنـا واتـە گۆرانیمـان بۆبڵێ ﴾
وە لە ڕیوایەتێکی تردا ﴿ السامدون واتـە : گـۆرانی بـە حومـەیری﴾ وە عکرمەو ضـحاك دەڵێن :﴿ السمود: واتـە:﴿ اللهو واللعب﴾واتـە گاڵتـەو گەپ و شتێ بێسوود کە مرۆڤ سەرقاڵکات بە بێ سوود﴾
وەعکرمـە دەفـەرموێت :﴿کـانوا اذا سمعـوا القرآن تغنـوا فنزلـت هـذه الاية ﴾
واتە:﴿کاتێ گوێیان لە قورئان دەبوو گۆرانیان دەووت بۆیە ئـەم ئایەتـە دابەزی﴾
وە ابو زید دەڵێ:

وكان العزيف فيها غناء للندامى من شارب مسمود

جا هەندێ لێرەدا دەڵێن ئەگەر بـەمانای گـۆرانی ووتـنیش بێـت دەبێـت مەبەست لەو گۆرانی ووتنە گۆرانی کـافران بێـت کەدژایـەتی قورئـان و دینی ئیسلامی پێدەکرێت !!!
ئێمەش لـە وەلامـی ئـەو بۆچـونانەدا دەلـێین : ﴿ مەبەسـت بـە گـۆرانی بەشێوەیەکی گشتی یە ناتوانرێ تایبەت بکـرێ بـە گـۆرانی دژی ئـایینی ئیسلام و قورئانی پیرۆز چونکە خۆ هەموو گۆرانی کافرانیش هـەمووی هەر دژایەتی دینی ئیسلام نەبووە بە دەلیلـی ئـەوەی گـۆرانی و مۆسـیقا

46 ـ﴿جامع البيان﴾٥٦٠/٢٢ ~٥٦١ باسانيد المتصله ، وانظر تفسير القرآن العظيم لابن كثير.

له پێش هاتنی ئایینی پیرۆزی ئیسلامیش هەر هە بووە وەنەفامەکان ووتویانە ، وەئەو کاتەش شتێ نەبووە بە ناوی قورئانی پیرۆزەوە وەیان دینی ئیسلام تا دژایەتی بکەن!!

وەزۆر جار گۆرانیەکانی پێش ئیسلامیان وتووە و هیچ دژایەتیەکی تێدا نەبووە ، بەڵکو ئەوانیش لە ناویاندا باو بووە وەکو هونەرێ ، بەڵام ئەوان ئەوەیان لێدێتەدی کاتێ قورئانی پیرۆز بخوێندرایە ئەمان هەڵگری گۆرانی و مۆسیقا دەبوون وە بێگومان ئەو لۆمەیەش کە خوای تعالی ﴿ جل جلاله﴾ دەیان کات حیکمەتی گەورەی تیادایە ، حیکمەتەکەش ئەوەیە کەکاتێ قورئانی پیرۆز هەبێت پێویستت بە گۆرانی و مۆسیقا نییە چ بۆ ئارامی دڵ وەچ بۆ چێژو لەزەت وەرگرتن ئایا هەیە لە قورئان ئارام بەخش و چێژ وەرگرتر؟!!!!بێگومان لە شوێنی خۆیدا انشاء الله روونی دەکەینەوە کە سروود و نەشیدە بێ ئامێرەکان دروستن وە لەکاتی بۆنەو ئاهەنگەکاندا کەتایبەت بوون دەفیش بەکار هاتووە وەبێگومان ئیسلام میانڕەوە هیچ لایەنێك لە لایەنەکانی ژیانی لەبیر نەکردووە بەڵام شتێکیشی بەڕەوا داناوە کە لەگەڵ کات و شوێن و سروشتی پاکی مرۆڤدا بگونجێ﴾

ئایەتی پێنجەم: لەسەر حەرام بوونی مۆسیقاو گۆرانی: خوای تعالی ﴿ جل جلاله﴾دەفەرمووێت:﴿وَاسْتَفْزِزْ مَنِ اسْتَطَعْتَ مِنْهُمْ بِصَوْتِك وَأَجْلِبْ عَلَيْهِمْ بِخَيْلِكَ ورجلِك وَشَارِكْهُمْ فِي الأَمْوَالِ وَالأَوْلاَدِ وَعِدْهُمْ وَمَا يَعِدُهُمُ الشَّيْطَانُ إِلاَّ غُرُورًا﴾[٤٧]

واتە:﴿هەرکەس لەوانەی کەدەتوانی گومڕای بکە بەدەنگت بەگۆرانیت وەبدە بە سەریاندا و تێیان خوڕە بەسوارو پیادەی سوپاکەتەوە

---

47 ـ﴿الاسراء﴾ الاية ٦٤

وەهاوبەشیان بکە لە ماڵ و سامان و منداڵیاندا بەڵێنیشیان پێ بدە بەلأم شە یتان بەڵێنیان پێنادات تەنها خەڵەتاندن نەبێت ﴾

قال ابن ابي حاتم في تفسيره حدثنا أبي اخبرنا أبو صالح: ﴿كاتب الليث﴾ حدثنا معاوية ابن صالح عن علي بن أبي طلحةعن ابن عباس :﴿واستفزز من استطعت منهم بصوتك﴾ قال :﴿كلُّ داعٍ دعى الى معصية الله ﴾

واتە:﴿ دەنگی شەیتان هەر بانگەوازکارێکە کەبەرەو سەرپێچی خوای گەورە ﴿جل جلاله﴾ بانگەشە دەکات﴾

دەی بێگومان مۆسیقاو گۆرانی گەورەترین بانگەواز کارە بۆ سەرپێچی خوای گەورە﴿ جل جلاله﴾لەبەر ئانەوەیە تەفسیر کراوەبە (صوت الشيطان)..

ابن ابي حاتم دەفەرموێت :﴿ حدثنا ابي اخبرنا يحي بن المغيرة اخبرنا جر ير عن الليث عن مجاهد ﴿ واستفزز من استطعت منهم بصوتك ﴾قال الغناء والطبل.....مجاهد دەفەرمووێت:﴿مەبەست گۆرانی وشتی پرپوچە﴾.

## ﴿قەدەغە كردنی گۆرانی و مۆسیقا لەژێر ڕۆشنایی فەرموودەی صەحیحدا﴾

بێ گومان هەرکەسێ زانست و زانیاری شاز لەناو زانایان و فەتوای فەرموودەناسانداهەڵبگرێ وەهەرچی بیرو بۆچوونی ڕوخسەتی و ڕێپێدانی تاکە تاکەی زانایان هەڵبگرێ و وورد بوونەوەی نەبێ لەسەر زانایانی تر و وەلاَم دانەوەیان بێگومان وەکو ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم دەفەرموێت:﴿مَنْ حَمَلَ شَاذ العِلم حَمل شَراً كَبِيرًا﴾[48]

واتە:﴿هەرکەسێ ناوازەو نامۆو شازی زانست هەڵبگرێ ئەوا خراپەو شەڕێکی گەورەی هەلگرتووە﴾

یان سلیمانی تمیمی دەفەرموێت :﴿ إنْ أخَذتَ بِرُخْصَة كُل عَالِم إجْتَمَعَ فِيكَ الَشر كُله﴾

واتە:﴿ ئەگەر تۆ ڕێپێدانی هەموو زانایەك وەرگری ئەوا هەموو شەڕێکت تیادا كۆ دەبێتەوە﴾

بۆیە هەر زانایەك هەر ناودارێك لەزانایانی ئیسلام بێ کەم و کورتی نیە ، بەلاَم کەم و کورتی گەورەی خەڵكی سەردەمی ئێمە لەوەدایە ئەو کەلێن و نە پێکانەی زانایانی زوو لەسەردەمی خۆیاندا نەیان پێکاوەو کەوتونەتە هەڵەوە خەڵكی سەردەمی ئێمە هەڵدەستن بە بەیان کردنی و پینەو پەڕۆکردنی بۆچوونەکانیان بێ ئەوەی گوێ بدەنە ئەو زانایانەی کەلەسەردەمانی خۆیاندا وەلاَمیان داونەوەو ڕەخنەیان لێ گرتوون و ڕاستی وحەقیقەتیان بۆ خەڵك ڕوون کردۆتەوە !!!بێگومان لێرەدا دەمەوێ مووسڵمانان لەوە تێبگەن کە هەلگرتنی زانست و

---

48 ـ﴿رواه ابوبكرالخلال في الامر با لمعروف﴾ص ٣٣بسند صحيح.

زانیاری به هەواو ئارەزووکاری نابێت و پێویستە لەهەر شتێ گومان و دوو دڵیمان هەبوو بگەڕێینەوە بۆ لای زانایانی شارەزا لەو بوارەدا ، بێگومان هەر زانایەك لە زانایانی ئیسلام دەریایەك لە عیلمن بەلام لە هەموو بوارێکدا لەزانست و زانیاری خوادا﴿جل جلاله﴾هیچ زانایەك هەموو عیلمەکانی لەلا وەکو یەك نەبووە واتە هەیە لەبواری تەفسیردا سەرقاڵ بووە هەیە لەبواری فەرموودەدا وەهەیانە لە بواری فیقهدا...هتد وە بێگومان لە سەردەمی ئێمەدا زانست و زانیاری بەرەو کەمی دەڕوات بۆیە دەبێ زۆر وریا بین و بزانین زانست و زانیاری لە کێ وەردەگرین ، بە داخەوە پێویستە ئوممەتی ئیسلامی سەرەخۆشی لێبکرێت لەوەی کە ئەو هەموو زانا بەرێزانەی پێشوو کەدەڕۆن زۆر بەکەمی بتوانرێ جێ ی بگیرێتەوە ، بەلام هەر چۆنێك بێ ئەم ئیسلامە زانای دڵسۆزوو بە ویژدانی تیادا ماوە ، کۆمەڵێ ماون کەپارێزگاری لە ئیسلام و بەرنامە پاکەکەی دەکەن بەقەڵەم و ووتارو نووسراو ، بەلام کەسانێ هەبوون لەسەردەمانی پێشوو ئێستاشدا لە غەیری زیان هیچیان بۆ ئەم ئوممەتە سەوز نەکردووە ،بۆیە پێویستە لەسەر مووسڵمانان کەوەرگرتنی زانست و زانیاریان دیاری بێت بزانن کێ هەڵگری حەقیقەت و ڕاستیە و کێ لەسەنگەری بەتاڵ و دژایەتیە ، چونکە پێغەمبەری خوا﴿ صلی الله علیه وسلم﴾زانیاری جوانی داوە لەبارەی زانست و زانیاریەوە دەفەرمووێ:﴿عن عبدالله بن عمرو بن العاص ﴿رضی الله عنه ﴾قال سمعت رسول الله ﴿ صلی الله علیه وسلم﴾یقول:﴿إنَّ اللهَ لايَقْبِضُ العِلْمَ انْتِزاعاًيَنْتَزِعُهُ مِنَ العِبَادِ ، وَلَكِنْ يَقْبِضُ العِلْمَ بِقَبْضِ

العُلَمَـاءِ ، حَتَّـى إِذَا لَـمْ يُبْـقِ عَالِمـاً ، اتَخَـذَ النَّـاسُ رُؤُسـاً جُهَّالاً ، فَسُئِلُوا ، فَأفْتَوا بِغَيْرِ عِلْمٍ ، فَضَلُّوا و اضَلُّوا﴾[49]

واتـه:﴿ بيـستومه لـه پێغەمبـەرى خـوا﴿ صلى الله عليه وسلم﴾ دەيفـەرموو بەڕاسـتى خـواى تعـالى ﴿جـل جلالـه﴾زانـست و زانيـارى لـە خـەڵكى وەرناگرێتەوە بە وەرگرتنـەوە ،بـەڵكو زانـست و زانيـارى وەردەگرێتـەوە بـەمردنى زانايـان هـەتا زانـا نـامێنێ ئەگـەر زانـا نـەما ئـەوا خـەڵكى چەندكەسـانێكى نـەزان هەڵدەبـژێرن بـۆ خۆيـان پرسـياريان لێ دەكـەن ئـەوانيش فـەتوا دەدەن بـەبێ زانـست ، خۆيـان گـومڕا دەبـن خـەڵكيش گومڕادەكەن﴾

خوێنەرى بەڕێز

﴿بـە پـشتيوانى خـواى گـەورە ﴿ جل جلالـه﴾ باسـى ئـەو فـەرموودە صەحيحانە دەكەين كە قەدەغەى مۆسيقاو گۆرانى دەكـەن وە انـشاءالله ئـەو شـوبهانە ئەڕەوێنينـەوە و نـايهێڵين كـە لەسـەر ئـەم فەرموودانـە درووستيان كردووە دەقى يەكەم لـەو فەرموودانـەى كەبەڵگـەن لەسـەر حەڕامى مۆسيقا و گۆرانى ، يەكـەم :﴿عـن عب الرحمن بن غنم قال حدثنى أبو مَالِكٍ الاشْعَرِيُّ﴿ رضى الله عنه﴾ وَاللَّهِ مَا كَذَبَنِيّ : سَمِعَ النبيَّ ﴿ صلى الله عليه وسلم﴾ يقـول﴿ لَيَكُـو نَـنَّ مِنْ أُمَّتِـي أقْوَامٌ يَسْتَحِلُونَ الحِرَ، والحَرِير ، وَالمَعَازِفَ، وَلَيـنْزِلَنَّ أقْوامٌ إلى جَنْـبِ عَلَـمٍ، يَـرُوحُ عَلَـيْهِمْ بِسَارِحَةٍ لَهُـمْ يَـأتِيْهِمْ _ يَعْـني الفَقِـيرِ _ لِحَاجَـةٍ،

---

49 صحيح مسلم وفى البخارى باب كيف يقبض العلم .

فَيَقُولُونَ:ارْجِعْ إِلَيْنَا غَداً فَيُبَيِّتُهُم_ الله ، وَيَضَعُ العَلَمَ، وَيَمْسَخُ آخَرِينَ قِرَدَةً وَخَنَازِير إِلى يَوْمِ القِيَامَةِ﴾[50]

واته:﴿ لەناو ئوممەتەکەم چەند کۆمەڵێك پەیدا دەبن زیناو ئاوریشم و شەراب و ئامێرەکانی مۆسیقا حەلاڵ دەکەن ، وەچەند کۆمەڵێکیش لە تەنیشتی شاخێك دادەبەزن پیاوی هەژارو نەدارسەردانیان دەکەن بۆ پێویستی ، ئەوانیش دەڵێن بڕۆن بە یانی وەرنەوە ، ئیتر ئەو شەوە خوای تعالی ﴿جل جلاله﴾ شاخەکە دەرمێنێ بەسەریانداو کۆمەڵێکیش دەکاتە سەر شێوەی مەیمون و بەراز هەتا ڕۆژی دوایی﴾.

شیخ الاسلام ابن تیمیة دەفەرمووێ:﴿والآلات الملهية قد صحَ فيها ماروا‌ه البخاري في صحيحه تعليقا مجزوما به داخلا في شرطه﴾[51]

سەرەتا دەمەوێ خوێنەری بەڕێز لەوە تێ بگات کەئەم فەرموودەیە صحیحە بەلام ابن حزم و هاوڕاکانی ڕەتیان کردۆتەوە بەلام بە پشتیوانی خوای گەورە ﴿ جل جلاله﴾ ڕوونی دەکەینەوە تائەو دوو دڵیە نەمێنێ:

سەرەتا ئەو زانایانەی ئەم فەرموودەیە بە صحیح دا دەنێن :

١.البخاري ٢.ابن حبان ٣. الاسماعيلي

٤.إبن صلاح ٥.النووى ٦.إبن تيمية

---

50 _البخارى معلقا مجزوماً به ، كتاب الاشربة، باب ماجاء فيمن يستحل الخمر ويسمه بغير اسمه ، برقم ٥٥٩٠، وهو في سنن أبي داود، كتاب اللباس ، باب ماجاء في الخز ، برقم ٤٠٣٩ ، وابن حبان ١٥٤/١٥ ، برقم ٦٧٥٤ ، والطبراني في الكبير ٢٨٢/٣، ، برقم ٣٤١٧ ، والبيهقي في السنن الكبرى ٢٧٢/٣ ،وصححه الالباني في سلسلة الاحاديث الصحيحة ١/ ١٣٩

51 _ ﴿ الاستقامة﴾١/ ٢٩٤

٧.ابن القيم ٨.ابن كثير ٩.العسقلاني
١٠. ابن الوزير الصنعانى ١١.السخاوى ١٢.الاميرالصنعاني
وەچەند زانايەكى تر ................
وەلەسەنەدى ئەم فەرموودەيە گرفتيان دروست كردووە كە بێگومان خۆى گرفتى تيادانيە بەڵكو بەهۆى بەدوادا نەچون و نەزانينەوەيە جا ابن حزم دەڵێ دابڕان هەيە لە نێوان بخارى وهشام دا وە هەروەها دەڵێ نەزانينى ئەو هاوەڵە الاشعريە!! ئەمە لە محلى دا دەڵێ ٥٩/٩ كەكۆتاى فەرموودەى ئەو بابەيە لاى ابن حزم ، وەهەروەها دەڵێ﴿هذامنقطع لم يتصل بين البخاري وصدقة بن خالد﴾
واتە:﴿ پچڕاوى هەيە لە بەينى بخارى وصدقه بن خالد﴾
دەڵێين بە پشتيوانى خواى تعالى﴿ جل جلاله﴾ لەوەلأمى ئەو گرفتانەى كە خۆيان گرفت نين الحافظ لە ﴿ تغليق التعليق﴾ دەفەرمووێ:﴿وهذا حديث صحيح لاعلة ولا مطعن فيه﴾
﴿واتە ئەم فەرموودەيە صەحيحەو هيچ كەم و كورتى و تانەى تيا نيە﴾
پاشان بابچينە خزمەت ابن القيم الجوزى ڕەحمەتى خواى لێ بێ لە كتێبى ﴿اغاثة اللهفان من مصايد الشيطان﴾بزانين چۆن وەلأم دەداتەوە ، دەفەرمووێ:
أ_﴿أن البخاري قد لقى هشام بن عمار وسمع منه فإذا قال ﴿قال هشام﴾فهوبمنزلة قوله عن هشام.
واتە:﴿ بوخارى بە هشام گەيشتوەو گوێ ى لێ بووە كاتێ كە دەڵێ هشام ووتى ئەوا لە پلەو مەنزيلەى ﴿عن هشام﴾ دەگەيەنێ.
ب_﴿أنه أدخله في كتاب المسمى بالصحيح محتجا به فلولا صحته عنده لما فعل ذلك﴾.

واتە:﴿ئەو فەرموودەی کردۆتە ناو صەحیحەکەی و کردویەتیە بەڵگە جا ئەگەر صەحیح نەبوایە لەلای نەی ئەخستە صەحیحە کەی ﴾

ج_﴿فالبخاري أبعد خلق الله عن التدليس﴾

واتە:﴿بخاری زۆر دوورە لە تدلیس واتە فێڵکردن و تێکەڵکردن﴾

ح_﴿انه علقه بصيغة الجزم دون صيغة التمريض فإنه إذا توقف في الحديث او لم يكون على شرطه يقول ويروى عن رسول الله ﴿صلى الله عليه وسلم﴾ ويذكر عنه، ونحو ذلك فإذا قال ﴿ قال رسول الله ﴿صلى الله عليه وسلم﴾وقال فلان فقد جزم وقطع بإضافته إليه ،وهنا قد جزم بإضافة الحديث الى هشام ، صحيح عنده﴾

واتە:﴿ بەستوێتیوە بە شێوەی بڕیار دان ﴿جزم﴾ نەیبەستۆتەوە بە شێوەی ناتەواو جا ئەگەر بوەستێ لە فەرموودەیە یان مەرجی نەبێت دەوترێ ﴿گێڕاوەتەوە لە پێغەمبەر﴿صلى الله عليه وسلم﴾ ﴾یان دەڵێن ﴿ لەوەوە باس دەکرێت ﴾وە نمونەی ئەوە ، جا ئەگەر ووتی ﴿ قال رسول الله ﴿صلى الله عليەس وسلم﴾﴾یان ﴿قال فلان﴾ واتە فەرمووی ، ئەوا بێ گومان بەشێوەی بڕیار دان و بڕینەوەیەتی بە پاڵ نان بۆلای ، لێرەدا بێ گومان بڕیار دراوە بە دانە پاڵی فەرموودەکە بۆ لای هشام کەواتە صحیحە﴾.

پاشان وادابنێ ئەم فەرموودەیە ﴿منقطع﴾ واتە: بچڕاوە کەبێگومان وانیە وەکوو ڕونمان کردەوە هەر نابێتە بەڵگە چونکە ئەو کاتەش ﴿علە کە نسبیە ﴾ جائز نیە بکرێتە بەڵگە چونکە لە چەند ڕێگەیەکی ترەوە کە ثقە ن واتەباوەڕ پێکراون گوێیان لێ بووە لە هشام بن عمار ﴾ەوە. جا لەوانەی بیستویانە لە هشامەوە :یەکەم:

ابن حبان لە صحیحە کە یدا ﴿٨/٢٦٥/٦٧١٩/_ الاحسان﴾دەفەرمووێ:﴿أخبرنا الحسين بن

عبـدالله القطـان قـال ﴿ حـدثنا هـشام بـن عمـار﴾ تـا دەگاتـه فەرموودەكە﴿المعازف﴾.

وە﴿قطـان﴾ هـذا ثقـة حـافظ تـرجم لـه في ﴿ سـير اعـلام النبلاء﴾١٤_١٢٨٧

كەواتە ثقەيە .

دووەم: الطبراني لـه ﴿ المعجم الكبير ﴾ دەفـەرمووێ:﴿٣١٩/٣/ ٣١٧/﴾ ودعلج في ﴿مسند المقلين "المنتقى منه رواية الذهبي ( ق١_١/٢)

دەفەرمووێ:﴿حدثنا موسى بن سهل الجوني البصري ثنا هشام بن عمار وەكوو ڕیوایەتەكەی بخاری

وەلەڕێگەی طبراني رواه الضياء المقدسي في ﴿ موافقات هشام بن عمار ﴾ق٣٧/١~٢

سێ یـەم :﴿وقال الطبراني في سند الشامين ﴾٥٨٨/٣٣٤/١:حدثنا محمد بن يزيد عن عبد الصمد الديمشقي ثنا هشام بن عمار به ، ومحمـد بـن يزيـد هـذا ﴿مترجـم في تـاريخ الدمـشق﴾ للحـافظ ابـن عـساكر ١٢٤/١٦ بروايـة جماعتـه عنـه وەبـاس كـراوە كـه وەفـاتی كردووە له (٢٦٩).

چوارەم :﴿قال الاسماعيلي في ﴿ المستخرج على الصحيح ﴾ ومـن طريقـة البيهقـي ﴿سـننه﴾ ٢٢١/١٠. حـدثنا الحـسن بـن سـفيان حدثنا هشام بن عماربه.، والحسن بن سفيان ~وهو الخراساني النيـسابوري حـافظ ثبـت مـن شـيوخ ابـن الخزيمـة وابـن حبـان وغيرهما من الحفاظ_ مترجم في السير ١٤/ ١٥٧~١٦٢.وەهەروەها لـه ﴿تذكرة الحفاظ﴾دا.

كەواتـه ئەگـەر ﴿ منقطع ﴾بێـت هـەر نابێتـه بەلگـەی ئەوانـەی دەیانەوێت فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ بـشێوێنن ،

کەواتە عیلەتی یەکەم کە ابن حزم باسی دەکات سەرابەو هیچی تر ،پاشان لە عیلەتی دووەمدا دەڵێت :﴿گومان هەیە لەناوی ئەو صەحابەیەدا!!! ﴾ بێگومان ئەوەش شوبهەیەو هیچی تر هەروەکوو حافظ لە ﴿الفتح ﴾دا ٢٤/١٠ دەفەرمووێ:﴿الشك في اسم الصحابي لايضر وقد اعله بذالك ابن حزم وهو مردود﴾

واتە:﴿ گومان لەناوی هاوەڵان زیانی نی یە وە بێگومان ئەمەی ابن حزم کردویەتیە عیلە وەرناگیرێ و بەرپەرچ دراوەیە ﴾. وەبێگومان تە ئکیدێکی تری تیایە کە گومان ناهێڵێ وەکو دەفەرمووێ :﴿والله ما کذبني ﴾ وەکو لێرەدا دیارە :﴿وقال هشام إبن عمار : حدثنا صدقة بن خالد حدثنا عبد الرحمن بن يزيد بن جابر :حدثنا عطية بن قيس الكلابي حدثنا عبد الرحمن بن غنم الاشهري قال : حدثنا أبو عامر أو أبو مالك الاشعري _والله ما كذبني . سمع النبي﴿صلى الله عليه وسلم ﴾يقول :فذكره ﴾پاشان هیچ پچڕاویەك نیە لە بەینی بوخای و صدقە بن خالد ﴾

وەکو حافظ دەفەرمووێت :﴿ وهذا حديث صحيح لاعلة له ،ولا مطعن فيه ، وقد أعله أبو محمد ابن حزم بالإنقطاع بين البخاري وصدقة بن خالد ﴾و بالإختلاف في اسم أبي مالك وهذا كما تراه قد سقته من رواية تسعة عن هشام متصلا فيهم مثل ﴿ الحسن بن سفيان﴾ و ﴿ عبدان ﴾ و ﴿ الجعفر الفرياني ﴾ وهؤلاء حفاظ أثبات.[٥٢]

52 _﴿تغليق التعليق﴾٢١/٥~٢٢.

کەواتە هەموو ئەوانە شوبهەو بێ بەڵگەیە بۆیە ئێمەش دەڵێن:

هەرکەس لەدین دا هەر شتێك بڵێ

بەڵگەی پێ نەبوو بۆی مەکە بەڵێ

زۆر کەس تیر بازی ئەتوانێ بەلاَم

نەی دا لەنیشان بائیتر نەڵێ.

پاشان باسی ووشەی ﴿یستحلون﴾ دەکرێ: ووشەی ﴿یستحلون﴾بەمانای ئەوە دێت کەوا حەلاَڵی دەکەن، واتە : بەهۆی فەتواو تەئویلاتەوە بە حەلاَڵی دەزانن ئەمەش جیاوازی زۆرە لەگەل ئەوەی کەحەڕام بە حەلاَڵ بزانن چونکە زانینی حەڕام بە حەلاَڵ دانان یان دانانی حەلاَڵ بە حەڕام بەمەرجێ بزانێ کافر دەبێت بەلاَم ئەوانەی بەتەئویل و هەڵە بەحەلاَڵی دەزانن بۆیە کافر نابن .

ومئەم فەرموودەیەش زۆر ڕۆشنە کە ئەم چوار شتەی کەباس کراون حەڕامن بەلاَم بەهۆی تەئویلات و فەتوای هەڵەوە بەحەلاَڵی دەزانن وەکو عەلامە شێخ علي القاري دەفەرمووێ:

﴿والمعنى يعدون هذه المحرمات حلالات بإيراد شبهات ، وأدلة واهيات ، منها ماذكره بعض علمائنا (يعني الحنفي) من ان حرير انما يحرم اذا كان ملتصقا بالجسد ، واما اذا لبس من فوق الثياب فلا باس به!!

فهذا تقييد من غير دليل نقلي ولا عقلي ،ولإطلاق قوله ﴿صلى الله عليه وسلم﴾ ﴿مَنْ لَبسَ الحرِير فِي الدُّنْيَا لَمْ يَلبَسه فِي الأخِرة﴾[٥٣]

---

53 _﴿ متفق عليه ﴾ من حديث انس وهو مخرج في ﴿الاحاديث الصحيحة ﴾برقم (٣٨٣) وفي غاية المرام برقم (٧٨﴾

وكـذلك لـبعض العلمـاء تعلقـات ب﴿المعـازف﴾يطـول بيانهـا وهـذا الحديث مؤيـد بقولـه تعـالى ﴿ ومـن النـاس مـن يـشتري لهـو الحـديث ليضل عن سبيل الله بغير علم ...﴾

واته :﴿ ماناكەی ئەوەيە كەئەوان ئەم حەرام كراوانە بە حەلاڵ دەزانـن بەهۆی هێنانەوەی چەند شوبهەو بەڵگەيـەكی بێهێـز لەوانـە كەهەنـدێ لـەزانايان باسـيان كـردووە و شـتی بـێ بەڵگـەيان هێنـاوە مەبەسـت لەزانايان ﴿الحنفيە ﴾ بۆ نمونە دەڵێن حەرير كاتێ حەرام دەبـێ كەبـە گيانا بنووسێ و بلكێ بەگياندا، بەڵام ئەگەر لەسـەر جلـەوە لەبـەربكرێ قەيناكـە !!! دەی ئـەم بەسـتنەوەيە بـەبێ بەڵگـەی نـەقڵی و عەقڵيـە !!! چونكە پێغەمبەر﴿صلى الله عليه وسلم ﴾ بەردەهای دەفـەرمووێ:﴿هەركەسـێ حەرير لەبەر بكات لە دونيادا لە ڕۆژی دواييدا لەبـەری ناكـات ﴾پاشـان بەلای ﴿الحنفيە﴾جياوازی دەكات لە شـەراب و مـەی بـۆ نموونـە دەڵێن شەراب لەترێ وەربگيرێ كەم و زۆری حەرامە ، بەڵام ئەگەر شـەراب لـە خورمـا وەربگـيرێ حەڵاڵـە ئـيلا مەگـەر زۆری سـەر خـۆش كـەرە !! جـا ئەمـەش وەكوو ئـەوە وايـە كەهەنـدێ دەڵێن گـۆرانی و مۆسـيقا ئەگـەر وروژێنەر نـەبێ حەرام نيە !! پاشان ابن تيميە ڕەحمەتی خوای لێبێت دەفەرمووێ﴿ لعل الاستحلال المذكور في الحديث انما هو بالتأويلات الفاسدة ، فإنهم لـو إسـتحلوها مـع إعتقـاد ان الرسـول حرمهـا كـانوا كفارا ، ولم يكونوا مـن امتـه،ولو كـانوا معترفين بانهـا حـرام لااوشـك ان لايعاقبوا بالمسخ كسائر الـذين لم يزالـوا يفعلـون هـذه المعاصـي ولمـا قيـل فـيهم ﴿ يـستحلون ﴾ فـإن المـستحل للـشيء هـو الـذي معتقدا حله فيشبه ان يكون استحلالهم الخمر يعني انهم يـسمونها بغـير اسمهـا كمـا في الحـديث ، فيـشربون الاشـربة المحرمـة، ولا يـسمونها خمـرا ، واسـتحلالهم المعـازف بإعتقـادهم ان الات الهـو

مجرد سمع الصوت فيه لذة وهذا لايحرم ، كألحان طيور واستحلال الحرير وسائر انواعه بإعتقادهم انه حلال للمقاتلة وقد سمعوا انه يباع لبسة عند القتال عند كثير من العلماء فقاسوا سائر احوالهم تلك!! وهذه التأويلات الثلاثة واقعة في الطوائف الثلاثة الذي﴾[٥٤] ، قال فيها ابن المبارك رحمه الله تعالى

وهل افسد الدين الا الملوك واحبار سوء ورهبانها.

واته:﴿دەشێ ئەو حەلاڵ کردنەی لە فەرموودەکەدا هاتووە بریتی بێ لە بە حەلاڵ زانینێ بەهۆی تەئویلاتی فاسیدەو تێکدەرەوە ، چونکە ئەگەر بە حەلاڵی بزانن و بڕوایان وابێت کەپێغەمبەری خوا ﴿صلى الله عليه وسلم﴾ حەرامی کردووە ئەوا پێ ی کافر دەبن وە لە ئوممەتی نابن واتە لە ئوممەتی دەردەچن ، وە ئەگەر ئەوان اعتراف بکەن واتە دانی پیادا بنێن حەرامە ئەوا نزیکە سزا نەدرێن بە گۆڕانیان بۆ شێوەی ناشیرین هەروەکوو ئەوانەی بەردەوام گوناه ئەنجام دەدەن ، وەکاتێ لەبارەیان دەوترێ ﴿یستحلون﴾ واتە بەحەلاڵی دا دەنێن کەبێگومان بەحەلاڵ دانانێکە بۆ شتێ کە ئەو بە بیروڕای خۆی بە حەلاڵی دەزانێ ،هەروەکوو خەمر و شەراب کەبەحەلاڵ دەزانرێ بە هۆی فەتواو تەئویلی هەڵەوە واتە ئەوان ناوی دەنێن بە غەیری ناوی خۆی هەروەکوو لە فەرموودەدا هاتووە ، وەشەرابی حەرام دەخۆنەوەو ناوی نابەن بەشەراب و عەرق ! وەبەحەلاڵ زانینی ئاوازەکانیش بەبیرو ڕای ئەوان یان باوەڕیان وایە کەئامێرەکانی سەرگەرمی تەنها دەنگێکی خۆشەو لەزەت و چێژی تێدایە و حەرام نیە وەکوو دەنگی باڵندە ، وەبە هەمان شێوە بەحەلاڵ دانانی ﴿حریر﴾ وەجۆرەکانی تریش

---

54 _﴿ ابطال التحليل ﴾ ص ٢٠~٢١. لابن تيمية .

بەبیروڕای ئەوان حەلاڵە وەبێ گومان دەبیسترێ کەڕەوایە لەکاتی جەنگ لە لای زۆرێ لە زانایان ، بیکەرە قیاس هەموو ئەوانەی تر لەسەر ئەوە ....﴾

پاشان شتێکی تر دەوروژێنن دیارە ئەوانەی بەدوای تەئویلات و سەرخستنی بیروڕای خۆیان وێڵن کورد ووتەنی کەسێ بکەوێتە ئاوێك پەنا بۆ چڵە پوشێکیش دەبات بۆ ڕزگار بوونی ، دەڵێن کاتێ مۆسیقا حەڕامە کەئەو تاوانانەی تریشی لەگەڵدا ئەنجام بدرێ!!!!!!! لە جوابی ئەمەشدا امام الشوکانی ڕەحمەتی خوای لێبێت دەفەرمووێ:﴿ویجاب بأنَّ الاقتران لادليل على المحرم هو الجمع فقط ، وإلا لزم أن الزنا المصرح به في الحديث ( يعني البخاري) لايحرم إلا عند شرب الخمر واستعمال المعزف ، واللازم باطل بالاجماع ، فالملزوم مثله ، وأيضاً يلزم في مثل قوله تعالى :﴿ إنَهُ كَانَ لايؤمِنُ باللهِ العَظيم ولاَ يَحُضُ على طعامِ المسكين ﴾ انَّهُ لايحرم عدم الايمان بالله إلا عند عدم الحض على الطعام المسكين!!!

فإن قيل : تحريم مثل هذه الامور المذكورة في الالزام قد علم من دليل آخر ، فيجاب بأن تحريم المعازف قد علم من دليل آخر أيضاً كما سلف على أنه لاملجيء الى ذالك حتى يصار اليه ﴾.

واتە:﴿ وەلامی ئەمەش بەوە دەدرێتەوە کە هاتنی ئەم تاوانانە بەیەکەوە بەلگە نیە لەسەر ئەوەی کەتەنها لە کاتێکدا حەڕامن کە هەموویان پێکەوە ئەنجام بدرێن ، چونکە ئەگەر وابێت دەبێ بلێین ( زینا ) حەرام نیە ئیلا مەگەر عەرەق و مۆسیقای لە گەڵ بێت !!! کە ئەمە بەتاڵە و نابێ وەخوای تعالی ﴿جل جلاله﴾ کەکاتێ دەفەرمووێ ﴿ چونکە بێ گومان ئەو بڕوای بە خوای گەورە نەدەکرد ★ وەهانی کەسی نەدەدا بۆ خۆراك دان بە هەژاران ﴾ دەی دەبێ بلێ ی ئیمان نەبوون

بە خوا ﴿جل جلاله﴾ حەرام نیە ئیلا مەگەر هانی کەس نەدات بۆ خۆراك دان !! کە ئەمە زۆر بێجێیە ، پاشان ئەگەر بوترێ حەرامی ئەو شتانەی تر کە لە گەڵی هاتوون بە هۆی بە لگەی ترەوە زانراوە واتە : ﴿ زیناو حەریرو عەرەق ﴾ ئەوا وەلامی ئێمەش ئەوەیە کە قەدەغەکردنی ئامێرەکانی مۆسیقا بە هۆی بە لگەی ترەوە زانراوە وەکو ئەوان هەر وەکو ئەو بە لگانەی کە لەوەو پێش باسمان کرد ﴾ لەکۆتای ئەم بۆچونە هەلانەدا دەڵێم : ئەی ئەو کەسانەی کەخواو پێغەمبەری خواتان خۆش دەوێت ﴿صلى الله عليه وسلم ﴾ : **فماذا بعد الحق إلا الضلال ؟!!.........أفحق هو؟ اللهم هل بلغنا................اللهم فأشهد.**

**فەرموودەی دووەم:**

**وعن شَبِيب بن بشر البَجلي ، قال :﴿سمِعْتُ أنس بن مالك ﴿رضي الله عنه﴾: يقول:﴿ قال رسول الله ﴿ صلى الله عليه وسلم﴾ ﴿ صَوْتَانِ مَلْعُونانِ في الدُّنيَاو الآخِرَة:مِزْمَارٌ عِنْدَ نِعْمَةٍ ، وَرَنَّةٌ عِنْدَ مُصِيبَةٍ﴾[٥٥]**

واتە:﴿دوو دەنگ لە دونیاو قیامەتدا نەفرەت لێکراون جوزەلەو مۆسیقا لێدان لە کاتی خۆشیدا وەهاوارو شیوەن لە کاتی موسیبەت و کارەساتدا ﴾

وە هەروەها شاهیدی تر هەیە کە دەبێتە هۆی بەهێز بوونی کەدەفەرمووێ:**﴿عَنْ جَابِرِ بن عبد الله ﴿رضي الله عنهما﴾ عن عبد الرحمن**

---

**٥٤_مسند البزار٢/٣٦٣ ، والضياء المقدسي في المختارة ١٨٨/٦ وحسنه الالبانيفي سلسلة الاحاديث الصحيحة ٧١٤/١ برقم ٤٢٧ وفي صحيح ترغيب والترهيب ١/ ١٩٧.**

بن عوف : فقال: قال رسول الله ﴿ صلى الله عليه وسلم﴾ ﴿إنـي لَمْ أَنْـهَ عَنِ البُكَاءِ وَلَكني نَهيتُ عَنْ صوتَيْنِ احْمَقَينِ فاجِرَينِ صَوْتٌ عندَ نِعْمة لهوِ ولَعِبِ وَمَزامير الشَيْطَانِ وَصَوت عنْدَ مُصيبَة، لَطم وُجوه وَشَق جيُوبِ ورِنَة الشيطَان﴾[56]

كەواتەئەم فەرموودەيەش بەلگەيە لەسەر حەرامى مۆسيقا و گۆرانى وە ابن تيميه رەحمەتى خواى لێبێت دەفەرمووێ:﴿هذا الحديث من اجود ما يحتج به على تحريم الغناء كما في اللفظ المشهور عن جابر بن عبد الله ﴿ صوت عند نعمة﴾لهو ولعب ، ومزامير الشيطان ﴾ فنهى عن الصوت الذي يفعل عند النعمة ، كما نهى عن الصوت الذي يفعل عند المصيبة ،والصوت الذي عند النعمة هو صوت الغناء﴾[57]

واتە﴿ ئەم فەرموودەيە باشترينى ئەو بەلگانەيە كە دەهێنرێتەوە لەسەر قەدەغە بوونى گۆرانى..................... نەهى كراوە لە دەنگێ كە لە خۆشيدا بكرێ هەروەكو چۆن نەهى كراوە لە دەنگێ كە لە موصيبەتدا دەكرێ وە دەنگێ لە خۆشيدا كە نەهى لێ كراوە دەنگى

---

56 _اخرج الحاكم ٤٠/٤ والبيهقى ٤/ ٦٩ وفى ﴿ الشعب﴾ ٢٤١/٧ ~١٠٦٣_١٠٦٤ ،وابن ابى الدنيا فى ﴿ذم الملاهى ﴾ق/١٥٩ ، والآجرى في ﴿ تحريم النرد﴾ ٦٣/٢٠١ ، والبغوي في شرح السنة﴾ ، ٤٣٠/٥~٤٣١ ، والطيالسى في مسنده ﴾ ١٦٨٣ ، وابن سعد في ﴿ الطبقات﴾ ١٣٨/١ ،وابن ابي شيبة في ﴿المصنف﴾ ٣٣٩/٣ وعبدبن حميد في ﴿المنتخب من المسند ﴾ ٨/٣~١٠٤٤ من طريق عن محمد بن عبدالرحمن بن ابي ليلى ن واقره الزيلعي في ﴿نصب الراية ﴾ ٨٤/٤ وابن قيم في ﴿ الاغاثة (٢٥٤/١)وسكت عنه الحافظفي الفتح ١٧٣/٣~ ١٧٤ ﴾ مشيرا الى تقوية كما هي قاعدة وقال الهيثمى في ﴿ المجمعي١٧/٣

57 _﴿الاستقامة﴾ابن تيمية ٢٩٢/١~٢٩٣

گۆرانیه ﴾. جا لێرەدا ابن تیمیه ڕەحمەتی خوای لێبێت دەفەرمووێ نەهی کراوە لە دەنگێ کە لە خۆشیدا بوترێ کە گۆرانی یەو مەبەستی پێ بۆنەکان نیە بەڵکو مەبەستی پێ ی کاتە خۆشەکانە کە غەیری ئەو بۆنانەن کە دەلیل و بە لگەیان لەسەرە ، والله اعلی واعلم.

فەرموودەی سێ یەم: عن ابن عَبَاسٍ ﴿رضی الله عنهما﴾ قال :قَالَ رَسُولُ الله ﴿ صلی الله علیه وسلم﴾:﴿إنَّ اللَّهَ حرَّمَ عَلَيْكُمْ الخَمْر ، والمَيْسِرَ، والكُوبَةَ ﴾ وقَالَ ﴿ كُلّ مُسْكِرحَرَامٌ﴾[58]

وە لە لفظ ابي داود ﴿إنَّ اللهَ حَرَّمَ عَلَيَّ _ أو حُرِّمَ الخَمْرُ، وَالمَيْسِرُ ، والكُوبَةُ﴾ قال ﴿ وَكُلُّ مُسْكِرٍ حَرامٌ﴾[59]

واتە:﴿ خوای گەورە ﴿ جل جلالە﴾ _ حەڕامی کردووە یان حەڕامی کردووە لە سەرم شەراب و قومارو تەپڵ و هەموو هۆشبەرێك .

ئێمەش دەڵێین :خطابي لە ﴿ المعالم﴾ ٢٦٨ دەفەرمووێ:

و﴿الكوبة﴾ يفسر ب ﴿الطبل﴾ وَيُقَال النَّرد وَيَدْخُل فِي مَعْنَاهُ كُل وِتر ومزهر ونَحو ذالك مِنَ المَلاَهِي والغِنَاء﴾

واتە:﴿ الكوبه مانا دەكرێت بە تەپڵ ، وە وتراوە بریتیی یە لە زارو هەر ئامێرێکی ژێ دارو مۆسیقایی لە ئامێرەکانی سەرقاڵی و گۆرانی دەگرێتەوە﴾.

---

58 _مسند احمد ٣٨١/٤ برقم ٢٦٢٥ ، وابن حبان ١٨٧/١٢ ، وابو يعلى ١١٤/٥، والبيهقي في الكبرى ٣٠٣/٨ ، وفي الشعب ٢٨٢/٤ ، والبزار، ٦/ ٤٢٥ ، والطبراني في الكبير ١٠١/١٢ ، وصححه الالباني في التعليقات الحسان ، برقم ٥٣٦٥ ن وسلسلة الاحاديث الصحيحة برقم ١٧٠٨

59 _ابو داود ن كتاب الاشربة ، باب في الاوعية ، برقم ٣٦٩٦ ن وصححه الالباني في صحيح سنن ابي داود ٤٢٣/٢.

وه احمد شاكر دەفەرموێت ﴿واجود من كل هذا وأحسن شمولاً قول احمد في كتاب ﴿الاشربة﴾ص (٢١٤/٨٤)﴾يعني ب ﴿الكوبة﴾كل شيء يكب عليه ﴾

واته :﴿له هه موو ئەم مانايانەدا چاكترین و گشتگیر ترینیان بریتیە له وتەی امامی احمد كه له كتێبی ﴿ الاشربه﴾ دەفەرمووێ مەبەست به ﴿الكوبه﴾ هەر شتێكه بەدەست لێبدرێ و پیای بكێشرێ وەهه روەها ﴿الجو هری﴾ یش دەفەرموێ مەبەست تەپلی بچوكه

پاشان ریوایەتێكی تر باشتر دەی چەسپێنێ كەمەبەست تەپڵە وەكوو ئەم ریوایەته

﴿ إنَّ الله حَرَّمَ عَلَيهم الخَمْرَ ، والمَيْسِر ، وَالُكوبَة ، وَهو الطَبل وَقَالَ كُلُّ مُسْكر حَرَام﴾ ~اخرجه احمد (٣٨٩/١) في الاشربة (١٤) والطبراني ١/ ١٢٦٠) والبيهقي ﴿١٠/٢١٣~٢٢١﴾وهذا اسناده صحيح من طريق عن قيس ، وقد وثقه ابو زرعة ويعقوب في ﴿المعرفة﴾ ١٩٤/٣ ﴾ وابن حبان ٥/ ٣٠٨ ) والنسائي والحافظ في( التقريب ) واقتصر ذهبي في ﴿ الكاشف﴾ على ذكر توثيق النسائي واقره ن ولذلك صححه الشيخ احمد شاكر في تعليقه على ﴿المسند ﴾في الموضعين ٤م ١٥٨~٢١٨﴾ والله اعلى واعلم

فەرموودەی چوارەم: عَنْ عبد الله بن عمر بن عاص~ رضي الله عنه ~ أنَّ رسول الله ﴿صلى الله عليه وسلم﴾ قَالَ:﴿إنَّ الله عزوجل حَرَّمَ الخَمْرَ ، والميسِر ، والكوبة ، والغبيرَاء وَكُلُ مُسْكِرٍ حرَام﴾[60]

60 _﴿أخرجه ابو داود (٣٧٨٥) والطحاوي في ﴿الشرح المعاني ﴾ ٣٢٥/٢ ، والبيهقي ١٠/٢٢١~٢٢٢﴾، واحمد ٢/ ١٥٨/ ١٧٠ ، و﴿الاشربة﴾ ٢٠٧~ ويعقوب الفسوي في ﴿المعرفة ﴾٥١٩/٢) وابن عبد البر في ﴿التمهيد﴾ ١٦٧/٥) والمزي في ﴿التهذيب﴾ ٤٥/٣١~٤٦)

واته:﴿بێگومان خوای پەروەردگار : مەی و قومارو ،تەپڵ و ﴿الغبیراء ﴾کەجۆرە عەرەقێکی سەر خۆشکەرە لە گەنمەشامی دروست دەکرێت ، هەموو ئەمانەی حەرام کردووە وەهەموو هۆش بەرو سەرخۆش کەری حەرامە ﴾

وە ئەم فەرموودەیە سێ ﴿﴿طرق﴾ی هەیە واتە سێ رێگەی هەیە کەشێخ أحمد شاکر تحقیقی کردووە وە ئەوەی کە راجحە ئەمەیە والله اعلم

فەرموودەی پێنجەم: عن عبد الرحمن بن سابط قال : قال رسول الله ﴿ صلى الله عليه وسلم﴾ ﴿ إنَّ فِي أُمَتي خَسْفاً، ومَسْخاً، وَقَذْفًا، قَالُوا يَا رسول الله وَهُمْ يَشْهَدُونَ أنْ لاَ الهَ إلاَ الله؟ فَقَالَ نَعم ،إِذَا ظَهَرَتِ المَعَازِف والخُمُور ولبسُ الحرير﴾[61]

واتە:﴿ بێ گومان لە ئوممەتم دا رۆچون و شێوەو دیمەن گۆڕان و بەردباران کران روو دەدەن ، ووتیان : ئەی پێغەمبەری خوا ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ جا ئایا ئەو کەسانە ئەو شتانەیان بەسەردا دێت شایەتیش دەدەن کە جگە لە خوا پەرستراوێکی دیکە نیە ؟ فەرمووی بەڵێ ، هەرکات ئامێرەکانی مۆسیقاو مەی خۆری دەرکەوتن وئاوریشم لەبەر کران .

فەرموودەی شەشەم: عن أبي مالك الاشعري قال:﴿ سمعت رسول الله ﴿صلى الله عليه وسلم ﴾ يقول:﴿ سيَكُونُ فِي أُمَتِي الخَسفِ والمسْخِ وَالقَذْفِ ،قَالَ :قُلْتُ

---

61 _﴿اخرجه ابن أبي شيبة وابن أبي الدنيا في ﴿ذم الملاهي﴾ وهو حديث حسن

فِيمَ يَارسول الله ؟ قَالَ بِاتِخَاذِهِم القَينَات وَشربِهِم الخَمْر ﴾[٦٢]
واته:﴿ لە مەودوا لە نێوان ئوممەتم دا بە زەویدا ڕۆبران و دیمەن و شێوەس گۆڕان و بە رد باران کران ڕوو دەدەن گووتی ووتم لەسەر چی ئەی پێغەمبەری خوا ﴿صلى الله عليه وسلم﴾ فەرمووی : بەهۆی ئەوەوە کەخو دەدەنەوە ئافرەتانی گۆرانی بێژو مەی خواردنەوە﴾
هەندێ لە بارەی ئەم دوو فەرموودە پیرۆزە واتە فەرموودەی پێنجەم و شەشەم شتانێکی بێ بنەما باس دەکەن بە پشتیوانی خوای تعالی ﴿ جل جلاله﴾ ڕۆشنی دەکەینەوە ، بۆ نموونە: دەڵێن ﴿پێغەمبەری خوا ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ ئوممەتەکەی هۆشیار دەکاتەوە کەوریابن بە ئارەزوو ویستی ڕابواردندا نەچنە خوارێ و زێدە ڕۆی نەکەن!!
لە وەلآمدا دەڵێین :﴿ بێ گومان پێغەمبەری خوا﴿صلى الله عليه وسلم﴾هەر شتێ کە قەدەغەو حەرام بێت یان اسراف بێت بە جۆرێکی وا کەبچێتە قالبی حەرام ئوممەتەکەی هۆشیار کردۆتەوە لێ ی وەرێگری لێکردوون دەی خۆی ئەوە بەلگەیە لەسەر ئەوەی ئەو شتە حەرامەو ڕێگە پێ دراو نی یە بۆیە ئەو سزا سەختە دەخاتە بەرچاوی ئوممەتی ، پاشان نابێت هیچ خوێندەوارێك بڵێ حوکمی یەك یەکی ئەو شتانەی کەباسکراون هۆکاری ئەو سزا خوایی یە لە خودی فەرمایشتەکان وەرناگیرێ !!وەدەبێت لە دەرەوەی ئەواندا بۆی بگەڕێین !!
ئێمە بەس ئەوەندە دەڵێین بۆ؟ چ ڕێگریەك هەیە ؟ خۆ ئەگەر هەر دانەیەکیان حوکمی جیاشی هەبێت و سەربە خۆی خۆشی هەبێت ئەوا لە سزادا هەرکەس بەقەد بەشی خۆی بەردەکەوێ ، کەئەوە ووتەی

---

62 _﴿اخرجه الطبراني ﴾ الكبير ، وابن عساكر والدولابي في ﴿ الكني والاسماء ﴾ وهو صحيح .

زانایانـه ، وەئەگـەر بـوترێ ئـافرەتی گـۆرانی بێـژ ﴿قینـه مغنیـه ﴾ لـه ڕۆژگاری پێغەمبەری خوادا﴿صلى الله عليه وسلم ﴾ شتێکی ئاسایی بووە!!! دەڵێین لەوانەیـە ئەوانـەی منـداڵی بـچوکن بـە ئـافرەتی گـۆرانی بێـژی بزانن!!! ناوی ئەو ئافرەتانەی کەلەسـەردەمی پێغەمبـەردا ﴿صلى الله عليـه وسلم ﴾ هەبوون ناویان چی بووە و لە کوێدا باس کراوەو دەلیـل و بەڵگـە چی یە ؟ بەکام دەلیل لەڕۆژگاری پێغەمبەری خـوادا ﴿صلى الله عليه وسلم ﴾گـۆرانی بێـژی ئـافرەت شـتێکی ئاسـایی بـووە؟!بێگومـان ئـەوە خـۆڵ کردنـە چـاوی مووسـڵمانانە چـونکە بـوونی ئـافرەتی گـۆرانی بێـژ لـە هەموو سەردەمێکدا بووە بـەڵام دان پێـدانانی دەبێتـە بەڵگـە دەی کـەی پێغەمبەر ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ دانی بە ئافرەتی گۆرانی بێـژدا نـاوە خـۆ لەم ڕیوایەتەدا بە ڕونی دیارە :

﴿عن السيد بن يزيد: أنَّ إمْرَاةً جَاءَتْ إلى رسُولِ اللهِ ﴿صلى الله عليه وسلم ﴾ فَقَالَ يَاعَائِشَةُ أتَعْرِفِينَ هَذِهِ؟ قَالَتْ لَايَانَبِيَّ الله ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ فَقَالَ هَذِهِ قَينَـةُ بَنِـى فُلانٍ ، تُحِبِّيْنَ أنْ تُغَنِّيَـك ؟ قَالَـتْ نَعَمْ ،قَـالَ : فَأعْطَاهَـا طَبَقـاً فَغَنَّتْهَـا ، فَقَـالَ النَّبِـيُّ ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ قَدْ نَفَـخَ الشَّيْطَانُ فِي مَنْخِرَيْهاَ﴾ [63]

واتــه:﴿ ئافرەتێـك هاتــە لای پێغەمبــەری خــوا ﴿ صلى اللـه عليـه وسلم ﴾ فـەرمووی ئـەی عائـشە ئەمەدەناسـی ؟ ووتـی نـەخێر ئـەی پێغەمبـەری خوا ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ فەرمووی ئـەوە گـۆرانی بێژەکـەی فـلان تیرەیـە ئایا حەز دەکەی گۆرانیت بۆ بڵێ ؟ ووتی : بەڵێ ، دەڵـی ئـەویش _واتـە پێغەمبەر ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ سینیە کـی پێـدا تـاوەکو وەکـوو دەف بـە کاری بێنێ ، ئیتر ئەویش گـۆرانی بـۆووت ، پێغەمبـەریش ﴿ صلى الله عليـه

63 _رواه أحمد والنسائي والطبراني وهو صحيح

وسلم ﴾ فەرمووی شەیتان فووی کردوە بە لووتیدا ﴿ زۆر جار ئەم فەرمووده پیرۆزە بە جۆرێ مانا دەکەن کەلە گەڵ پینەو پەڕۆیاندا بگونجێ بێ ئەوەی سەرنج بدەنە ماناو مەبەستی فەر موودەکە ، سەرەتا دەڵێین :

ئەو ئافرەتە دیارە هاتۆتە لای پێغەمبەر ی خوا ﴿ صلی الله علیه وسلم ﴾ دیارە ئافرەتەکە ئیشی هەبووە نەوەکو پێغەمبەری خوا ﴿ صلی الله علیه وسلم ﴾ بانگی بکات و گۆرانی پێ بڵێ پەنا بەخوا شتی وا دوورە لە پێغەمبەری خوا ﴿ صلی الله علیه وسلم ﴾ یان گوێ بیستی شتێ بێت کەخۆی بفەرمووێ ﴿ شەیتان فووی کردووە بە لو تیدا ﴾ بێ گومان شتی وا ناگونجێ !!پاشان دەبێ بیر بکرێتەوە و بزانرێ هەزارەها پیاو ژن و منداڵ ...هتد هاتونەتە لای پێغەمبەر ﴿ صلی الله علیه وسلم ﴾ پێغەمبەر ﴿صلی الله علیه وسلم ﴾ نەی فەرموو عائیشە ئەوە دەناسی خۆ زۆرێ لەو ئافرەتانەش عائیشە نەی ناسیون ئەی بۆچی پێغەمبەر﴿ صلی الله علیه وسلم ﴾ فەرمووی عائیشە ئەمە ئەناسی ؟!! بۆ ئەوەی سەرنجی عائیشە ڕابکێشێ بۆ ئەو سیفەتەی کە لەو ئافرەتەدا هەیە ئەگەر بپرسرێ بۆچی ؟

دەڵێین چونکە ئەو سیفەتە بەلای پێغەمبەری خواوە ﴿ صلی الله علیه وسلم ﴾ بێزراوەو نەویستراوە و ئەیەوێ عائیشە تێ بگەیەنێ کە گۆرانی و مۆسیقا و ...... هتد دەبێ لێیان دوور بێت و توخنیان نەکەوێ بە دەلیلی ئەوەی کە دوایی فەرمووی شەیتان فووی کردوە بە لووتیدا ، واتە لەو کاتەدا فرسە تێ بووە لە دەعوەی پێغەمبەر ﴿ صلی الله علیه وسلم ﴾ کە عائیشە ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێت حاڵی بکات پشکی شەیتانی تیایە ، پاشان هەندێ بە تەئویلی بێ ئاگا دەڵێن مەبەستی پێغەمبەر ﴿

صلى الله عليه وسلم ﴾ لەوەی کە فەرموویەتی ﴿ شەیتان فووی بە لووتیدا کردووە ﴾ مەبەست پێ ی تەفاعولی لە گەڵ گۆرانیەکەدا کردووە !!

دەڵێین خوای تعالی ﴿ جل جلاله﴾ لە ئێوەش و ئێمەش خۆش بێت چۆن دەوێرن بۆچوونی وا بڵێن ؟ کەی سیفەتی پێغەمبەر ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ وابووە کەشتێ قەناعەتی پێ ی هە بێت و دوایی بەخراپ وەسفی بکات !!! واتە بە لایەوە گۆرانی و مۆسیقا جائز بێت بەلاّم دوای سیفەتێکی خراپی بداتە پاڵ !! خۆ پێغەمبەری خوا ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ هەموو ئەخلاقی قورئان بووە چۆن کاتێ خوای تعالی بفەرمووێ ﴿ وقولوا للناس حسنا ﴾[64]

پێغەمبەر ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ دڵی ئافرەتێك دەشکێنێ و دەفەرمووێ شەیتان فووی بە لووتیدا کردووە ئەگەر ئەو شتە بە خراپ نەزانێ و بۆ ڕوون کردنەوەی ئوممەتی نەبێت ، هەر خۆی بەڵگەی تەواوی هەیە لە فەرموودەی دایکمان عائیشە ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێت کە دای بە لای ماڵێکدا کەسێك گۆرانی دەووت و سەری دەلەقاند فەرمووی ﴿ أف الشيطان أخرجوه أخرجوه ﴾ واتە: ﴿ ئۆف شەیتان بیکەنە دەرەوە بیکەنە دەرەوە ئەوانیش کردیانە دەرەوە ﴾[65]

پاشان عائیشە لە کوێوە فێربووە لە غەیری پێغەمبەری خواوە ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ کە بەو حیکمەتە جوانە تێ ی گەیاند ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ بۆیە پێشتر ووتم بە تەئویلی بێ ئاگا چونکە ئەگەر تەئویلەکەش بە ئاگای بێت جێ ی سەرنج و تێدا ڕامان دەبێت بەلاّم بەبێ ئاگای !! پەنا بەخوا!!

---

64 _﴿ البقرة ﴾

65 _رواه إبن أبي شيبة ١٩٣/٤ وابن أبي الدنيا ٣٦،

بۆیـه دهڵێین مووسـڵمانان دهبـێ بـه ئاگابن و هەڵنـه خلیـسکێن بـه فـهتوا و تـهئویلاتی ههڵـه وه لهسـهر ڕاڕهوی قورئـان و سـوننه ت لانـهدهن ، تهنانـهت نهك له حهرام بهڵكوو لهشتێ كه گومانی تێدا بێ دوورهكهوی نهك تهئویل و پینهو پهڕۆی بۆ بكهی ، وهئهگهر كهسێ بڵێ بۆچی پێغهمبهر﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ سـینیهكی دایـه لـه جیـاتی دهف لێ ی بـدات ؟ دهڵێین ئـهوه بهڵگهیـه لهسهر ئهوهی كهپێغهمبهری خوا ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ دهف لهماڵیدا نهبووه ، پاشانیش ئهوهنده گرنگی پێنـهداوه چونكه مهبهستی ڕوون كردنـهوه بـووه به حیكمهت چونكه ئهگهر پێغهمبـهر ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ بایـهخی پێبدایـه ئهی فهرموو ئادهی دهفێكی بۆبێنن !!بـهڵام چونكه مهبهسـتی گوێ لێگرتن نیـه مهبهسـتی ڕوون كردنهوهیـهتی بـۆ عائیـشه و ئوممـهتی سینیكی دایـه خۆ مهعلومی ههموو كهسێكی به ویژدانه كه كهسێك دهنگیشی خۆش بێت بهسینی دهف لێبدات كهس حهز ناكات گوێ ی لێبگرێت !! والله اعلى واعلم .

## ﴿قهدهغه كردنی مۆسیقاو گۆرانی بهلای مهزههبهكان و زانایان﴾

إمامی ابوبكر طرطوشی﴿ڕهزاو ڕهحمهتی خوای لێبێت﴾ لـهبارهی تحـریم الات دهفهرمووێ:﴿الحمد لله رب العالمين والعاقبة للمتقين ولاعدوان الا على الظالمين ونساله ان يرينا الحق حقا نتبعه ، والباطل باطلا فنجتنيه، وقد كان الناس فيما مضى يستتر احدهم بالمعصية اذا واقعها ثم يستغفرالله ويتوب اليه منها ثم كثر الجهل وقل العلم وتناقض الامر حتى صار احدهم ياتي المعصية جهارا ، ثم ازداد الامر ادبارا حتى بلغنا ان الطائفة من اخواننا المسلمين وفقنا الله واياهم ، استزلهم الشيطان واستغوى عقولهم في حب الاغاني واللهو

، وسماع القطقطة والنقير ، واعتقدته من الدين.....وخالفت الفقهاء والعلماء وحملة الدين ﴿ ومن يشاقق الرسول من بعد ما تبين له الهدى ويتبع غير سبيل المؤمنين نوله ماتولى ونصله جهنم وساءت مصيرا ﴾ فرأيت ان أوضح الحق واكشف عن شبه الباطل بالحجج التي تضمنها كتاب الله وسنة رسوله ﴿صلى الله عليه وسلم ﴾ وابدا بذكر اقاويل العلماء الذين تدور الفتيا في أقاص الارض حتى تعلم هذه الطائفة إنها قد خالفت علماء المسلمين في بدعتها والله ولي التوفيق﴾

واته:﴿ لەدوای سوپاس و ستایشی خوای گەورە ، دەفەرمووێ لە پێشیندا ئەگەر کەسێك بکەوتایەتە هەریەك لە گوناهو تاوان ئەوا دایدەپۆشی و دەگەڕایەوە بۆ لای خوای گەورە ﴿جل جلالە﴾بەلاَم پاش ئەوە نەزانین زۆر بوو زانست و زانیاری کەم بوو شتەکان پێچەوانە بوونەتەوە تاوای لێهات کەسێ کە گوناه و تاوان دەکات بە ئاشکرا دەیکات و بەوەشەوە نەوەستاوە زیادی کردووە بۆپشت هەلگردن هەتا وای لێهاتووە کەپێمان گەیشتووە هەندێ لە برایانی مووسلمان خوای گەورە ﴿ جل جلالە﴾ تەوفیقمان بدات وەتەوفیقی ئەوانیش بدات شەیتان پێ ی هەلخلیسکاندون و لە خشتەی بردوون و زالَ بووە بەسەریاندا و هەست و هۆشی لەدەست داون بەوەی کە خۆشەویستیان دەردەبڕن بۆمۆسیقاو گۆرانی ولهو وەگوێ گرتن لە دەنگی ئاواز دەرکەرەکان ، وا دەزانن ئەمە لە دینی ئیسلامدایە ... بەلاَم پێچەوانە و خیلافی ئەوانن واتە فقهاو زانایان و ئەوانەی کە هەلگری دینی ڕاستە قینەن ﴿ هەرکەسێ دژایەتی پێغەمبەر بکات ﴿صلى الله عليه وسلم ﴾ پاش ئەوەی کەڕاستی بۆڕوون بوویەوە و شوێنی ڕێگایەکی تربکەوێ بێجگە

لەڕێگـەی بـڕوا داران ڕووی وەردەگێـڕین بـۆ ئـەو ڕێبـازەی کـە هەڵیبژاردووە وە دەی خەینە ناو دۆزەخ کەچ پاشە ڕۆژێکی خراپە﴾ [66]
بۆیە دەبینم کە ڕاستی ڕۆشنە وە ڕۆشنی دەکەینـەوە وەئـەو بۆچون و شـوبهە خراپـە هەڵانـەی کـە ئـەهلی باتـڵ درووسـتیان کـردوە دەرەوێنینەوە بەو بەڵگانەی کە قورئـان و سوننە لـە خۆی گرتـووە وە دەفـەرمووێ بـە ووتـەی زانایـان ئـەو زانایانـەی کـە لـە تـەواوی زەوی دەگەڕێنـەوە بـۆ فـەتواکانیان دەست پـێ دەکـەم هـەتا بزانـرێ کـە ئـەو هـۆزو کۆمەڵانـەی کـە گـۆرانی و مۆسـیقا بـە دروسـت دەزانـن ئـەوا پێـچەوانەی زانایـانی ئیـسلامن﴾ سـەرەتا باسـی امـامی مالـك ﴿ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێت ﴾ دەکات بۆیـە بـە پشتیوانی خـوای گـەورە ﴿ جل جلاله﴾ بۆچونی هەر چوار مەزهەبەکە لێرەدا ڕوون دەکەینەوە و ووتەی ڕاستی خۆیان دێنین :
امامی مالك : عن اسحاق بن عیسی بن الطباع قال:﴿ سألت مالك بن انس عَمَّا يَتَرَخَّصُ فِيهِ أَهْلِ الَمدِينَةِ مِنْ الغِنَاءِ ؟ فَقَالَ إِنَّمَا يَفْعَلهُ عِنْدَنَا الفُسَاق﴾ [67]
واتـە:﴿ئیـسحاقی کـوڕی عیـسای طبـاع دەفـەرمووێ:﴿لـە مـالیکی کـوڕی ئەنەسـم پرسـی لـە بـارەی ئـەو ووتنـەی کـە خـەڵکی مەدینـە مۆڵـەتی

66 _﴿النساء﴾ ١٥١~

67 _رواه احمـد ﴿العلـل﴾بـرقم ١/٢٣٨،صـحيح،والامر بلمعـروف والنهـي عـن المنكـر﴿للخـلال﴾ص ١٦٥، والكـافي لابـن عبـد البـر٢/ ٢٢٥،وتفـسير القرطبي١٤/٥٥،وعون المعبود١٣/ ١٨٦، وقال الغزالي في احياء علوم الدين ومعه تخريج الحافظ العراقي ٣/٢٣٧.

پێدەدەن لە گۆرانی ؟ فەرمووی ﴿ لای ئێمە بەس ئەوانە دەیکەن کەزۆر لارێ بوون و لایان داوە﴾
وەهەروەها هەر امامی مالك دەفەرمووێ: ﴿اذا اشْتَری جَارِیَة فَوَجَدَها مُغْنیَة کانَ لَهُ انْ یَرُدَها بالعَیْب﴾[68]
واتە:﴿ئەگەر کەسێ جاریەکی کڕی دوایی زانی کە گۆرانی بێژە دەتوانێ بیگێڕێتەوە بە عەیب بۆ خاوەنەکەی واتە بەعەیب دەژمێرێ﴾ جا هەندێ لێرەدا شوبهەیەك دروست دەکەن و دەڵێن مالك بەس وەسفی گۆرانی بێژی مەدینەی کردووە و نەیگوتوە هەرکەسێ یان گوێ ی بۆ بگرێ فاسیقە!! یان دەڵێن قسەکانی زانایان بەووردی وەکوو خۆی نقلْ نەکراوە بۆ نموونە دەڵێن هەیە باسی ﴿سماع﴾ هەندێك لە ئەهلی تەصەوف لاری ﴿منحرف﴾ی کردووە بەلاّم کە قسەی لێوە نقلْ کراوە واپیشان دراوە کە بە گشتی قسەی کردووە !!
ئێمەش لە وەلاّمی ئەوانەدا دەڵێین ماشاءالله لەو پینەو پەڕۆیە ....
باشە ئەگەر بپرسین ئایا گۆرانی بێژانی مەدینە هەزار قات لە گۆرانی بێژانی ئێمە باشتر نەبوون ؟!!!!!
پاشان جیاوازی چیە لە نێوان مووسڵمانانی مەدینەو مووسڵمانانی مۆزەمبیق لە قەدەغە کردنی حەرامێکدا ؟! پاشان هەر ووتەی امام مالکە ﴿ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێت ﴾ فەرموویەتی جاریە لە دوای کڕینی ئەگەر گۆرانی بێژ بێت ئەگەڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی بە عەیب دەژمێرێ ئەکرێ بڵێین امامی مالك فەرموویەتی دەچێتە لای ئەهلی تەصەوف و گۆرانی دەڵێ!!!!!! بێ گومان مرۆڤی ژیر خۆی تێ دەگات ....وەهەندێك هەیە دەڵێن لە بارەی امامی مالکەوە ڕەزاو ڕەحمەتی

68 _انظر الی من یحب السماع ص ٣٠/بتحقیق مجدی فتحی السید.

خوای لێبێت ﴿ أنه كانت جوارية في بيته يضربن بالمعزف﴾بێگومان به بڕوایەکی تەواوە دەڵێین امامی مالك ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێت شتی وا لە ماڵیدا نەبووە و ئەو سەنەدە ڕاست نیە چونکە بە صحیحی هێنامان امامی مالك فەرمووی ﴿انما يفعله عندنا الفساق﴾
وەبێگومان زانایان لەسەر ئەوەش ڕەدیان داونەتەوەو دەڵێن ئەگەر ئەو سەنەدە ڕاستیش بێت هەر نابێتە بەڵگە چونکە پێچەوانەی قورئان و سوننە یە کە سەنەدەکە بەڕاست دانانرێ والله اعلم ، پاشان ئەگەر ڕاستیش بێت پێچەوانەی ئەویش هەر ڕاستە واتە امامی مالك ڕاشکاوانە دەڵێت کە حەرامە دەی ئەمەیان وەربگرین بێگومان ترە بە لکو پێویستیشە ئەم ڕایەیان وەربگرین کە دەفەرمووێ لارێکان دەیکەن، وە شێخ الالبانی دەفەرمووێ:﴿ثم روى الخلال بسنده الصحيح ايضا عن ابراهيم بن منذر ﴿مدني ثقة من شيوخ البخاري﴾وسأل فقيل انتم ترخصون في الغناء ؟فقال معاذ الله ما يفعل هذا عندنا الاالفساق﴾
واتە:﴿ پرسیار لە ابراهیم کوڕی منذر کە مەدەنی ثقة یە لە شەیخی بخاریە پرسیاریان لێکرد ئایا ئێوە ڕێگە دەدەن بە گۆرانی و مۆسیقا ؟ فەرمووی پەنا بەخوا هیچ کەس شتی واناکات لە ناوماندا ئیلا مەگەر لەڕێ دەرچووەکان نەبێت . وە ئەمەش مەزهەبی هەموو ئەهلی مەدینە کاتێ باسی گەڕاندنەوەی جاریە دەکەن بە عەیب حسابی دەکەن کە گۆرانی بێژ بێت بە تەنها ابراهیمی کوڕی سعد نەبێت کە زکریا لە الساجی دەگێڕێتەوە دەڵێ قەیناکە والله اعلم .
امام أبو حنيفة:

بێگومان امامی ابو حنیفە ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێت لە بارەی مۆسیقاو گۆرانی زۆر توندە بە جۆرێ بە حەرامی دا دەنێت کە گوێ

لێبونی هەموو ئاوازێ وەکوو شمشاڵ و دەف و هەتا لێدانی دار لە شتێ بەسەرپێچی ناو زەند دەکات و دەفەرمووێ فاسق دەبێت ، وەشایەتی لێوەرناگیرێ وە لەوەش زیاتر دەفەرمووێ گوێ لێ گرتنی فاسق بوونە وەچێژ لێ وەرگرتنی کوفرە .

وە ابو یوسف ﴿ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێت ﴾ کەیەکەم قوتابی بەرزێتی دەفەرمووێ﴿في دار يسمع صوت المعازف والملاهي ادخل عليهم بغير اذنهم لأن النهي عن المنكر فرض فلو لم يجز الدخول بغير اذن لامتنع الناس من إقامة الفرض ﴾

واتە:﴿ لە ماڵێ ببیسترێ دەنگی معازف ئەوا بچۆرە ژورەوە بەبێ مۆڵەت وەرگرتن لەبەر ئەوەی ڕێگری لە منكر و خراپە واجبە ، ئەگەر ڕێگە دراو نەبێ چونە ژورەوە بەبێ ئیزن ئەوە ڕێگری خەڵکی دەکرێ لە هەستان بە بەجێ هێنانی واجب.﴾ وە ئەم ابو یوسفە ناوی ابو یوسف بن ابراهيم الانصاريەلە ساڵی ١١٢ ك لە دایك بووە وە زۆر سەرقاڵی فەرموودە بووە وەیەکەم قوتابی بەرزو زیرەکی امامی ابو حنیفە یە ڕەزاو ڕەحمەتی خوایان لێبێت هەتا لە بواری فەرموودەدا یحیی کوڕی معین دەفەرمووێت﴿ليس في أصحاب الحديث اكثر حديثا ولا اثبت من ابي يوسف وقال ايضا ابو يوسف صاحب الحديث وصاحب السُنة﴾

واتە:﴿ لە هاوەڵانی فەرموودە نەبووە کەسێ کە بە ئەندازەی ابو یوسف فەرموودەی لە بەربێت و لای جێگیر بوبێ وەهەروەها ناوی دەبەن بە خاوەنی فەرموودەو سوننە ﴾

پاشان سێ قوتابی تری گەورەی إمام أبو حنیفە بەناوی﴿ زفر بن الهذيل بن قيسي الكوفي ~ ومحمد بن الحسن بن فرقد الشيباني~ والحسن بن زياد اللؤلؤي الكوفي﴾کە ئەم چوار قوتابیە بەڕێزە بلاَو

کەرەوەی مەزهەبی ابو حنیفەن ﴿ ڕزاو ڕەحمەتی خوایان لێبێت﴾ بەلایانەوە مۆسیقاو گۆرانی حەرامە والله اعلی واعلم .

امام الشافعي:

بێگومان بەلای مەزهەبی شافیعیش ﴿ ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێت ﴾ حەرامە وەکوو دەفەرموویێت:﴿إنَّ الغنَاء لَهو مَكْروه يُشبِهُ البَاطلَ والمحال ، ومَنْ اسْتَكثرَ منْهُ فَهُو سَفيه تردشَهادته﴾[69]

واته:﴿ بێگومان گۆرانی و لهو ناپەسەندە وە دەشوبهێ بە باتڵ و نەشیاو وەهەرکەسێ زۆر بەکار هێنەری بێت ئەوا کەم عاقڵەو شایەتی لێوەرناگیرێ ﴾ وە زۆرێ لە هاوەڵانی و ئەوانەی لەسەر ڕاڕەوی شافیعین دەڵێن حەرامە وە ئینکاری دەکەن لەوەی کە هەرکەسێ شتێك بەو ناوەوە بخاتە پاڵ شافعی ﴿ ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێت ﴾ جا لەو زانا بەرزانەی کە ناو دارن لە مەزهەبی شافیعیشدا ئەوە دەڵێن وەکو ﴿الطیب الطبری ~ الشیخ ابي اسحاق ~ وابن صباغ﴾ وەهەتا شێخ ابو اسحاق دەفەرمووێ﴿ لاتصح ~ يعني الاجارة~ على منفعة المحرمة ، كغناء والزمر وحمل الخمر﴾[70]

واته:﴿ڕاست نیەو ڕەوا نیە پاداشت و سوود وەرگرتن لە شتێ حەرام بێت وەکوو گۆرانی و شمشاڵ و هەڵگرتن و مامەڵەی شەراب﴾

وەهەرووەها دەفەرمووێ: ﴿ ولایجوز على المنافع المحرمة لأنه محرم فلا يجوز أخذ العوض عنه كالميتة والدم﴾[71]

---

69 _﴿ ادب القضاء﴾

70 _﴿التنبه﴾ الشيخ ابى اسحاق .

71 _﴿ المهذب﴾ لشيخ ابي اسحاق .

واتە: ﴿ دروست نیە سوود وەرگرتن لە حەرام لەبەر ئەوەی حەرام کراوە وەجائز نیە ڕەوا نیە وەرگرتنی پاداشت و کرێ لەسەری وەکوو مردارەوەبوو خوێنە﴾.

وە لە فەرموودەیەکی شافیعیش دا ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێت ﴾ هاتووە دەفەرمووێ﴿وصاحب الجارية اذا اجمع الناس لسماعها فهو سفيه ترد شهادته﴾وەلەوە خراپتریشیان پێ دەڵێت و دەفەرمووێ﴿هو دياثة فمن فعل ذلك كان ديوثا﴾

واتە: ﴿ خاوەنی جاریە ئەگەر هاتوو خەڵکیشی کۆکردەوە بۆ گوێ لێگرتنی ئەوە بێ عەقڵە و شایەتی لێ وەرناگیرێ وەدەفەرمووێ ئەوەی ئەوە دەکات دیوثە واتە غیرەت و پیاوەتی تیانیە و گەوادە.... واللە اعلى واعلم .

إمام أحمد بن حنبل:

لە مەزهەبی امام احمدیش﴿ ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێت ﴾ مۆسیقاو گۆرانی حەرامە وەکو عبد الله کوڕی دەفەرمووێ ﴿سألتُ أبي عَنِ الغِناءِ ؟ فَقَالَ الغناء ينبت النفاق في القلب ، لايعجبني﴾ ثُمَّ ذكر قول مالك ﴿ انما يفعله عندنا الفاسق﴾

واتە:﴿ پرسیارم لە باوکم کرد سەبارەت بە گۆرانی ؟ فەرمووی گۆرانی دووڕوی ئەچێنێ لە دڵدا ، بەلامەوە باش نیە پاشان باسی فەرمایشتەکەی امامی مالك کرد و فەرمووی ئەوانەی ئەوە دەکەن لەناوماندا لاڕێ بوەکانن.

وەلە گێڕانەوەیەکی صحیحدا هاتووە کە چەند منداڵێکی هەتیوی بێ باوك جاریەیەکی گۆرانی بێژیان بۆ بە جێ مابوو کە گۆرانی بێژ بوو وویستیان بیفرۆشن امام احمد پێیانی فەرموو واتە بەبێ باوکەکان ﴿لاتباع الا على انها ساذجة فقالوا اذا بيعت مغنية ساوت عشرين

الفا ونحوها واذا بيعت ساذجة لاتساوى الفين فقال لاتباع الا على انها ساذجة ﴾
واتـه:﴿امـامى احمـد رِەزاو رِەحمـەتى خـواى لێبێـت پـێ ى فـەرموون نافرۆشرێ يان مەيفرۆشن مەگەر بەسادەى نـەبێت واتـە بـەبێ شـەرتى گۆرانى ووتن و ئاواز لێدان وتيان ئاخر ئەگەر بە سيفەتى گۆرانى بێـژ بيفرۆشين ئەوا ئەگاتە بيست هـەزار يـان ئەنـدازەى ئـەوە بـەلاَم ئەگـەر بـە سادەى بيفرۆشـين ئـەوا ناگاتــە دوو هــەزار فـەرمووى نافرۆشـرێ مەگـەر لەسـەر سـادەى خـۆى نـەبێت ﴾ جـا بێگومـان ئەگـەر قـازانج و سوود وەرگرتن لە گۆرانى و مۆسيقا حـەلاَلْ بوايـە ئـەوا نـە يدەهێـشت پارەى ئەو بێ باوك و هەتيوانە برِوات !!!!
طبرى دەفەرموێت: ﴿ فقد اجمع العلماء الامصار على كراهيـة الغنـاء والمنع منه وإنما فارق الجماعة ابراهيم بن سعد وعبيـد الله العنبرى وقد قال رسول الله ﴿صلى الله عليه وسلم ﴾ من فـارق الجماعـة مـات ميتـة جاهلية﴾[72]
بۆيـە زانايـانى كـۆن واتــە هــەر چـوار مەزهەبەكـە لەسـەر ئـەوەن كـە مۆسيقاو گۆرانى حەرِامە وەرِێگرى دەكەن وە ئـەوەى كـە جيـا بۆتـەوە لێيــان ابــراهيم بــن ســعد وعبيــد الله العنــبرى يــە وە پێــشەوامان دەفــەرمووێ﴿ صــلى الله عليــه وســلم ﴾ هەركەســێ لــە كۆمــەڵى مووسڵمانان جيا بێتەوە دەمرێ وەكوو مردنى نەفامەكان﴾
وەهيچ بەڵگەيەك نيە كە بەسەنەدێكى رِاست هاتبێ كە گوێ بيستى گـۆرانى بـوبن ، بـەلاَم ئـەو حاڵەتانـەى كـەباس دەكرێـت لـە حاڵەتـە

72 _﴿بەشێكە لەو فەرموودەيە كە ابن عباس رضى الله عنهما ﴾دەيگێرِێتەوە كە ﴿متفق عليه﴾ە

جائیزەكانە واتە ڕێگە پێدراوەكان كە انشاءالله ڕوونی دەكەینەوە لە چ حاڵەتێكدا ڕێگە پێدراوە ، پاشان ناوی هەندێ لە تابیعی دەهێنرێ كە گوێ بیستی گۆرانی ومۆسیقا بوون وەكوو عمری كوڕی عبد العزیز كە بێگومان ئەو سە نەدانە ش ڕاست نین بەڵكو سەنەدی ڕاستی ئەوەیە كە إمامی اوزاعی ﴿ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێت ﴾ دەفەرمووێت :﴿كتب عمر بن عبدالعزیز إلى عمر بن ولیدكتاباً فیه...﴾ إظهارك المعازف والمزمار بدعة في الاسلام، ولقد هممت أن ابعث الیك من یجز جمتك جمة السوء﴾[73] ئەوەتا سەرهەڵدانی و بەكار هێنانی بە بیدعە دەزانێ لە ئیسلامدا وە چ هەڕەشەیەكی توند دەكات ﴾

پاشان ابو حفص الاموی عمر بن عبد الله دەفەرمووێت:﴿كتب عمر بن عبد العزیز الی مؤدب ولده ان یربیهم علی بغض المعازف ﴾ واتە :﴿ نووسراوی نارد بۆ پەروەردە كەری كوڕەكەی و پێی فەرمووكەپەروەردەی بكات لەسەر ڕق لێبوونی ئامێرەكان﴾ ئیتر لە كوێ عمری كوڕی عبدالعزیز گوێ بیستی گۆرانی بووە؟!!!

یان ناوی عامر بن شراحل ﴿الشعبي﴾ هاتووە كە بێگومان وانیە چونكە لە سەنەدێكی ڕاستدا هاتووە لە اسماعیل بن ابی خالد كە دەڵێ:﴿ انه كره اجر مغنیة وقال ما احب ان اكله﴾[74]

كەواتە بە لایەوە پەسەند نەبووە كە كرێی گۆرانی بێژ بخورێت، پاشان ناوی ﴿ شریح القاضی﴾ هاتووە بێگومان ئەویش وانیە بەڵكو

---

73 _﴿اخرجه النسائي في سننه ٢/ ١٧٨ ، وابو نعیم في الحلیة ٥/٢٧٠ بسند صحیح وذكره ابن عبد الحكم في سیرة عمر ١٥٤~ ١٥٧ ، ورواه ابو نعیم ٥/ ٣٠٩.

74 _ ﴿اخرجه ابن ابي شیبة ٧~٩~٢٢٠٣ بسند صحیح.

سەنەدی ڕاست ئەمەیە :﴿قال ابو حفص﴿إنَّ رجُلاً كسر طَنبور رجُل فَخاصَمَهُ الى شُرَيح فَلَمْ يَضْمَنهُ شَيئًا ﴾[75]

واتە:﴿ پیاوێك تەپڵی پیاوێكی شكاندبوو شكاتەكەیان بردە لای شریح القاضی شریح هیچی بە كابرا نەبژارد ﴾

پاشان سەبارەت بەوەی كەناوی چەند هاوەڵێكی بەڕێزی پێغەمبەر هاتووە ﴿صلى الله عليه وسلم ﴾ كە گوێ بیستی گۆرانی و ئامێرەكانی بوون ئەوە تێكەڵ كردنێكە بێویژدانی ڕوونی پێوە دیارە چونكە ئەوان لە چەند حاڵەتێكی جیادا نەبێت كە ڕێگە پێدراوە قسەیەكی بێ بنەماو بێویژدانیە بۆ نموونە دەڵێن : عمری كوڕی خطاب !! یان عوسمانی كوڕی عفان !! یان سعدی كوڕی ابي وقاص !! ئێمە دەڵێین إمامی عمر و هەموو هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ زۆر دوورن لەوەی كە گوێ بیستی مۆسیقاو گۆرانی بوبن وە لە لهو دا كات بە سەر بەرن ، وەكاتێ بەڵگەیە باس دەكرێت دەبێ بەبێویژدانی نقڵ نەكرێ بۆ نموونە :﴿ لە ابی شعب الحرانی بە سەنەدێ لە خالد لە ابن سیرین دەیهێنێ كە ﴿ان عمر بن الخطاب كان اذا سمع صوت دف سال عنه؟ فإن قالوا:عرس ، او ختان سكت ﴾

واتە:﴿ ئەگەرامامی عمر ﴿ ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێت ﴾ گوێی لە دەنگی دەف بوایە پرسیاری دەكرد ؟ ئەگەر بیان ووتایە زەماوەندە یان خەتەنەكردنە بێ دەنگ دەبوو ... دەی ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە گوێبیستی نە بووە و بۆ خۆی ئەوەی لێدەر دەهێنرێ كە كاتێ پرسیاری كردووە مانای وایە ئەگەر بۆنە نەبێت ڕێگە نادات !!! وەبۆیە

---

75 _﴿اخرجه ابن ابي شيبة في النصف ٧~ ٣١٢، ٣٢٧٥، واسناده صحيح ، والبيهقي ٦~١٠١ و الخلال ص ٢٦

ئەمەم بە بەلگە هێنایەوە زۆر جار بێ تێگەیشتن دەیکەن بە بەلگە !
بەلام بەلگەیە لەسەر ئەوەی کە امامی عمر بەلایەوە ڕەوا نەبووە
هەروەکوو جار هەبووە ئافرەت کە دەفی لێداوە امامی عمری بینیوە لە
ترساندا لای بردوە !!!! ئیتر لە کوێ امامی عمر گوێی لێگرتووە ؟!!
وەبۆیە لێرەدا ئەمەم نەهێنا بە بەلگەی حەرامی چونکە پچڕاوی هەیە
بەلام هەندێ بە نەزانین بە بەلگەی بێدەنگ بوون و گوێ لێ گرتنی
امامی عمر ئەیهێنن (حاشا).... کەواتە بە بەلگە هێنانەوەی هاوەلان
لادانە لە ڕاڕەوی خۆی ، وەبۆسەرخستنی بۆچونی تایبەتی خۆیانە و
نابێتە بەلگە وەکوو ڕۆژی ڕوون دیارە ، وەفەرموودەی خۆیان واتە
هاوەلان بەلگەیە لەسەر بە حەرام دانانی بۆنموونە:
﴿ابوبکری صدیق﴾ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێت ناوی بردووە بە
(مزمور الشیطان) واتە جوزەلەی شەیتان کە ڕیوایەتی موسلم ە .
یان ﴿عوسمانی کوڕی عەفان﴾ ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێت
دەفەرمووێت :﴿والله مَا تَغَنيتُ، ولا تَمَنَّيتُ ﴾[76]
واتە:﴿نەگۆرانیم ووتوە نەبە ئاواتم خواستووە﴾

وەهەروەها ﴿ئیمامی علي﴾ ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێت ~
حافظ ابن كثير لە تأريخە کەیدا دەفەرمووێ:﴿لما انصرف علي﴿رضى الله عنه﴾من النهروان قام في الناس خطيبا ، فذكر خطبة طويلة بليغة

---

76 _﴿ابن ماجة، كتاب الطهارة ن باب كراهية ، باب كراهة مس الذكر باليمين والاستنجاء باليمين برقم ٣١١، والطبراني في الكبير ١٩٢/٥ برقم ٥٠٦١، وابو يعلى في معجمه، ص ٢١٧، وابن المنذر في الاوسط ٣٣٨/١ ن والبيهقي في الدلائل ٦/ ٣٩٠ ، وابن عساكر ١٦٣/٤٤، وانظر : فصل الخطاب ص ١٠٥.

فيها :﴿ ومجالس اللهو تُنسي القرآن ، ويحضرها الشيطان ، وتدعو الى كل غيّ﴾[77]

كەواتە كۆڕی لهو دەبێتە هۆی بیرچوونەوەی قورئانی پیرۆز و ئامادەبوونی شەیتان وەدەبێتە بانگەوازێ بۆ هەموو سەرپێچی و لادان و لەسنوور دەرچوونی کەئەمە فەرموودەی امامی علی یە ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێت. یان دەڵێن سەعیدی کوڕی مسیب گوێ بیستی مۆسیقاو گۆرانی بووە دەڵێین بێگومان ئەویش ڕاست نیە چونکە خۆی دەفەرمووێ:﴿إني لأبغضُ الغناء﴾[78]

واتە: ﴿زۆر ڕقم لە گۆرانیە﴾

یان دەڵێن ﴿عطاء بن أبي رباح﴾ کە بێگومان ڕاست نی یە چونکە ئەهلی مەککە لە ئەتباعی ابن عباسن ﴿ڕەزاو ڕەحمەتی خوایان لێبێت﴾ وە لە وانەی کە ئەتباعی ابن عباسن وەکوو ﴿مجاهد، عكرمة ، عطاء ابن ابي رباح﴾ هەموویان ڕاڤەی ئایەتی ﴿لهو الحديث﴾ یان بە گۆرانی و مۆسیقا کردووە وە پێیان حەڕامە وەلە هەمووی سەیر تر ئەوەی کە دەڵێ عطاء بن ابي رباح گوێ ی لە گۆرانی گرتووە دیارە نەیناسیوە چونکە وەکوو زانایان لە باسیدا دەفەرموون زۆر بێدەنگ و کەم قسەبووە بەڵام کاتێ پرسیاری لێ دەکرا دەفەرموون وامان ئەزانی پێی دەڵێنەوە واتە مؤیدە ! وە لەگەڵ ئەوەشدا کە پێنج تا شەش کەم و کورتی لە لاشەیدا بووە نازانم چۆن بە و کەم و کورتیانە وە زانایەکی وا گوێی بۆ گۆرانی و مۆسیقا گرتبی ؟!! بێگومان شتی وا نەبووە و بە لگەی بێبنەمان !! هەموو کەسێکی بە ویژدان دەزانێ کە

---

77 _﴿البداية والنهاية﴾٣٠٧/٧ ، وانظر فصل الخطاب ص ١٠٥.

78 _﴿اخرجه عبد الرزاق في ﴿المنصف﴾بسند صحيح.

ئـەو زانـا بـەڕێزە گەورانــە زۆر دوور بــوون لــە مۆسـیقاو گـۆرانی و تەنانەت کۆڕێ کە لهو لغوی تیادابێت .والله اعلم.
یان دەڵێن ﴿فضیل بن عیاض﴾کەبێگومان ئـەم سـەنەدانە ڕاست نـین بە ڵکو سەنەدی ڕاست ئەوەیە کە خـۆی دەفـەرمووێت : ﴿ الغنـاء رقیـة الزنا﴾ کەواتە گۆرانی و مۆسیقا پلە یەکەو ڕاکێشەری زینایـە ، پاشـان ﴿ضحاك﴾ دەفەرمووێ:﴿الغناء مفسدة القلب مسخطة للرب﴾
واتە:﴿ گۆرانی تێکدەری دڵە و تووڕەکەری خوای گەورەیە ﴿جل جلاله﴾﴾
وە ﴿الشعبي﴾ دەفەرمووێ:﴿لعن المغني والمغنى له﴾ [79]
وە ابـن عمـر ﴿ڕەزاو ڕەحمـەتی خـوا لـە خـۆی و بـاوکی بێـت﴾ جوانی فەرمووە دەڵێن جارێ لەلای جاریەیەکی بچوکدا تێپـەڕی بینـی گـۆرانی دەڵێت فەرمووی :﴿لو ترك الشيطان احدا لترك هذه﴾ [80]
واتە :﴿ ئەگەر شەیتان وازی لە کەسێك بهێنایە ئـەوا وازی لـەو منداڵـە دەهێنا﴾ بۆیـە دەڵـێین ئەوانـە هـەموو شـتی نـاڕەوان کـە دەدرێتـە پـاڵ هـاوەڵان وسـەلەف وەهـیچ سـەنەدێکی ڕاسـتیان نیـە کـە هـاوەڵان گـوێ بیـستی مۆسـیقاو گـۆرانی بـوبن وە بـە ووتـەی ابـن حـزم و الـشوکانی و الغزالی و هاوشێوەی وەکوو ئەوان مۆسیقاو گۆرانی حـەڵاڵ نـابێ .... وە ئەگەر بەڵگەی ڕاست هەیە کە هاوەڵانی پێغەمبەر ﴿صلى الله عليه وسلم ﴾ گوێ بیستی ئامێرەکان بوون دەلیل و بـە ڵگەکانتان کـوان؟؟؟؟ خـۆ نـاو هێنـان و نووسـینی ناوەکانیـان نابێتـە بەڵگـە.... بۆیـە دەڵـێم هـاوەڵان بـەرین لـەوەی کـە گـوێ بیـستی ئامێرەکـان بـوبن وەکـوو بـەری بـوونی گورگەکە لە خوێنی یوسف علیه السلام .

---

79 _﴿ تلبيس ابليس﴾

80 _﴿تلبيس ابليس﴾

## ﴿ڕەواندنەوەی شووبهەکان﴾

پاش ئەوەی ئەو دەلیل وبەلگانەمان باس کرد کە بەلگەن لەسەر حەڕام بوونی مۆسیقا دیارە بە بەلگەی قورئان و فەرموودەی صحیحی پێغەمبەر ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ سەلمێنرا وە پاشان ووتەی هاوەلان وزانایان و مەزهەبەکانمان هێنا ، بەلام دلنیام هێشتا هەندێ لە مووسلمانانی سادەو ساویلکە لە دوودلیدان نەك لەبەر ئەوەی قەناعەت بەو بەلگانە ناکەن ! بەلکو لەبەر ئەوەی هەندێ کەسی دڵ نەخۆش شوبهە لە دلی مووسلماناندا دروست دەکەن دیارە ئەمەش لەبەر خاتری بیرو بۆچونەکانیانە بۆیە پاساوی بۆ دێننەوە و لە گەڵ بەرژەوەندی خۆیان ئەیگونجێنن ، بەلام دلنیا بن هەر قەلەمێ بڕیار بدات لەسەر حەلالی مۆسیقاو گۆرانی و ئامێرەکان لە گەڵ شمشێری حەجاج جیاوازی نیە چونکە زۆر جار کاریگەری زمان لەسەر ئوممەتی ئیسلام لە کاریگەری شمشێر بە هێزترە جا ئەو بە شمشێرو کۆمەلێ لە ئێستادا بە زوبان بۆیە ئێمەش دەلێین ﴿ والله المستعان﴾ . بۆیە دەلێین یان ڕاڤەی فەرموودەکانیان وەکو خۆی نەکردوە یان پاساو بۆ بۆچونی تایبەتی خۆیان دەهێننەوە جا ئەوەی کە دەیکەنە بەلگەی ڕەوای گۆرانی و مۆسیقا بە پێچەوانەوەیە بەلکوو بەلگەیە لەسەر قەدەغە بوونی تەنها لەو حالەتانەدا نەبێت کە باس کراون وەڕونمان کردەوە بۆنموونە:

﴿فەرموودەی یەکەم﴾:

﴿عن عائشه رضى الله عنهاقالت:﴿ دَخَلَ أبو بكرٍ وَعندي جَارِيَتَان مِنَ الأنصَارِ ، تُغَنِّيانِ بِمَا تَقَاوَلَتْ الأنصَارُ يَوْمَ بُعَاث،قَالَتْ وَلَيْسَتَا بِمُغَنِّيَتيْنِ، فَقَالَ أبُو بَكْر:أمَزَامِيرُالشَّيْطَانِ فِي بَيتِ رَسُولِ الله

﴿ صلى الله عليه وسلم﴾ ؟وَذَلِكَ فِي يَوْمِ عِيْدٍ ، فَقَالَ رسُولُ اللهِ ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ ﴿ يَاأبَا بَكْرٍ إنَّ لِكُلِ قَوْمٍ عِيْداً ، وَهَذا عِيْدُنَا ﴾ وَهذ ا لفظ البخاري وفي رواية للبخاري :﴿ دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللهِ ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ وَعِنْدِي جَارِيَتَانِ تُغَنِّيَانِ بِغِنَاء بُعَاثَ ، فَأضْطَجَعَ عَلى الفِراشِ ، وحَوَّلَ وجْهَهُ ، و دَخَلَ أبو بَكْرٍ فَأنْتَهَرني ، وَ قَالَ :مِزْمَارةُ الشَّيْطَانِ عِنْدَ النَّبي ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ فَأقْبَلَ عَلَيهِ رَسُولُ اللهِ ﴿صلى الله عليه وسلم ﴾ فَقَالَ : ﴿ دَعْهُمَا ﴾ فَلَمَا غَفَلَ غَمَزْتُهما فَخَرَجَتَا ﴾[81]
وفي الرواية للبخارى ومسلم أيضاً ﴿ أنَّ أبَا بَكْرٍ ﴿ رضى الله عنه﴾ دَخَلَ عَلَيْهَا وَعِنْدَهَا جَارِيَتَانِ في أيَّامِ مِنى تغنيَانِ ، وَ تَضْرِبَانِ ، ورسُولُ اللهِ ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ مُسَجَّى بِثَوْبِهِ ، فَأنْتَهَرهُمَا أبُو بكْرٍ ، فَكَشَفَ رسول اللهِ ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ عنْهُ وَقَالَ :﴿ دَعْهُمَا يَا أبَا بَكْرٍ ، فَإنَّهَاأيَّامُ عِيْدٍ ﴾[82]
وه شيخ الالبانى ڕەحمەتى خواى لێبێت كۆى لەفزەكان و ڕيوايەتەكان دەهێنێ ئەمەش ئەو ڕيوايەتانەيە:﴿قَالت رضي الله عنها :﴿ دَخَلَ عَلَيَّ رَسول اللهِ ﴿ صلى الله عليه وسلم﴾وَعِندى جَارِيَتَان ﴿ من جَواري الانصار ﴾ وفي الرواية﴿ قينتان﴾ في ايَّام منى ، تُدَفِفَان وَتَضْرِبَان ،تُغَنيَان بِغِنَاء ، وفي الرواية بما تَقَاوَلَتْ وفي الاخرى:تَقَاذَفَتْ ، الانصار يوم بُعَاث ﴿ وَلَيْسَتَا بِمُغَنِيَتَينِ﴾فَاضْطَجَعَ عَلى الفراش ، وحوَّلَ وجهَهُ وَدَخَلَ أبو بكر ﴿ والنبي﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ مُتَغَش

---

81 _﴿البخاري ، كتاب العيدين ، بَاب الحراب والدرق يوم العيد ، برقم ٩٤٩.

82 _﴿البخاري ، كتاب العيدين ، بَاب إذَا فَاتَهُ العيد يصلي ركعتين ، برقم ٩٨٧. ومسلم كتاب صلاة العيدين باب الرخصة في اللعب الذي لا معصية فيه ، في أيَام العيد برقم ٨٩٢

بِثَوبِـهِ ﴾ فَـانْتَهَرَني ، وفي روايـة فَانتَهرهمـا ، وَقَـالَ ﴿ مزمـارة وفي الرواية مزمار ﴾ الشيطان عند وفي الرواية ﴿ امَزامير الشيطان في بيت رسول الله ﴿ صلى الله عليه وسلم﴾ مرتين؟!!﴾

واته:﴿عائشه _خوا لێ ی ڕازی بێت _ دەفـەرموویت : ئـەبو بـەکر ڕەزاو ڕەحمـەتی خـوای لێبێـت _ هاتـە ژوورەوە منـیش دووکـچۆڵەی ئەنـصاریم لابـوو دوو دەفیـان پـێ بـوو یاریـان پـێ دەکـردوو گۆرانیـان دەگوت بەو هۆنراوانەی کە ئەنصاریەکان لـە ڕۆژی ﴿بعاث﴾ دا شـەڕە شیعریان پێ کردبوون فەرمووی گۆرانی بێژیش نەبوون جا ئەبوبـەکر فـەرمووی چـۆن دەبێـت زوڕناکـان وە لـە ڕیوایـەتێکی تـردا بـەزوڕنای شەیتان لە ماڵی پێغەمبەر ی خوا ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ لێ بـدرێ ؟اوەلـە گێڕانەوەیەکـدا ئەبووبـەکر ڕەزاو ڕەحمـەتی خـوای لێبێـت نەیهێـشت و نەهی لێکـردن و فـەرمووی چۆن ئەمەدەکەن لـە کاتێکـدا پێغەمبـەر ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ دانیشتووە ؟! وە ئەوەش لە جەژنی ڕەمـەزانی پـیرۆزدا بوو جا پێغەمبەر ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ فەرمووی ئـەی ئـەبوو بـەکر هـەر کۆمەڵ و گەلێك جەژنێکیان هەیە ئەمەش جەژنی ئێمەیە

بە پـشتیوانی خـوای تعـالی جـل جلالـە هەڵـسەنگاندنێ لـە م فـەرموودە پـیرۆزەدا دەکـەین بـە کـۆی لـە فزەکـان بـۆ ئـەوەی ڕۆشـن بێتـەوە بـۆ مووسڵمانان چونکە هەندێ بۆچوون لێرەدا دەڵێن ڕەوایە دەف هەمیشە بـەکار بێـت و گـۆرانی لـە گەڵـدا بـوترێ و چـەند شـوبهەیەکی تـر کـە پشتیوان بە خوای تعالی ڕوونی دەکەینەوە :

سەرەتا بە پشتیوانی خوای تعالی جل وعلا دەڵێین :

لەم فەرموودە پیرۆزەدا بە ڕۆشنی دیارە وە هـەر کەسـێ سـەرنجی ئـەم فەرموودە پیرۆزە بدات بۆی دەردەکەوێ کـە هـیچ ڕەواییـەکی تێـدا نیـە بـە مطلقـیوە کـوو ئـەوەی بانگەشـەی بـۆدەکرێ ، پاشـان ئەمانـەی کـە

دەفیـان لێ داوە دوو مـنــداڵی بـچووك بـوون دەی ئەمــە چـۆن دەبێتــە بەڵگەی هەمیشەیی بۆ ئـافرەت یـان پیـاو !!!وە بێگومـان ئیـستا هـەموو ئامێرەكـان بــەكار دێــت و هــەموو ڕۆژەكــانی ســاڵ مۆســیقاو گــۆرانی تەوازنی گوێ ی مووسڵمانانیان تێك داوە ! كـە ئـەوە هەڵەیـەكی ڕۆشـنە و كەس ناتوانێ ئینكاری لێ بكات كە ئـەو فـەرموودە ناكرێتـە بـە لگـەی ئێستا كـە بـەو هـەموو ناشـەرعیە دەكـرێ ، وە هەڵـە یـەكی ڕۆشـن كـە هەندێ تـێ ی كـەوتون دەڵـێن ئینكـاری پێغەمبـەر ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ لەسەر ئینكاری ئەبوبەكر ڕەزاو ڕەحمـەتی خـوای لێبێـت كـە فـەرمووی ﴿أمزمـار الـشيطان عنـد رسـول الله ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ بەڵگەبەكـە ڕێگە پێ دراوەو گرفتی تێدا نیە!!!

ئێمەش دەڵێین هـیچ ئینكاریـەك لـەو فـەرموودەدا نیـە هـەتا بەڕێگـەی ئیشارەت و ئاماژە ش بەڵكوو ئینكاری پێغە مبـەر ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ كە ئینكـاری ئەبوبـەكر دەكـات  ڕەزاو ڕەحمـەتی خـوای لێبێـت لـە سـەر دوو كچۆڵە بچو كەكەیە وە عیلە تەكەش دەبەستێتەوە بـە وە وە كـە ﴿ فإن لكـل قـوم عيـدا وهـذا عيـدنا﴾ هـەموو قـەوم و گـەلێ جـەژنێكی خۆیان هەیە ئەمەش جەژنی ئێمەیە ، ئەوەش لە بەلاغـەی پێغەمبـەرە ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ وەكوو ئەوەی بفەرمووێ ئەی ئەبو بـەكر ئینكاریـت لەسەر مـەزامیر ئەصلە وە حەقە بەڵام هەڵەكەت لەوەدایـە كـە ئینكـاری ئەو دوو كچۆڵە دەكەی چونكە جەژنە، پاشان هەنـدێ دەڵـێن ئەبوبـەكر ڕەزاو ڕەحمـەتی خـوای لێبێـت ئەصـلە كـەی پێكـاوە ئـەم ئەصـلەی لـە كوێــوەوە هێنــاوە ؟!!واتــە چــۆن دەزانــێ ڕێگــە پێــدراو نیــە بــە چ بەڵگەیەك؟!

بەڕاستی ئەمە سەر لێشێواوی دەردەخات و نەزانی و پینەو پەڕۆیە !!

دەڵێین : لە پێغەمبەری خواوە ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ هێناویەتی لەو هەموو بەڵگانەی کەباس کران ئێمە ئەشێ لەوان ئاگادار تر بین !! وە ئەبوبەکر ڕەحمەتی خوای لێبێت بێ ئاگا بوبێ!!!! پاشان ئەبو بەکر ڕەحمەتی خوای لێبێت نەیزانیایە کە ڕێگە پێدراو نیە چۆن پێش پێغەمبەری خوا دەکەوێ ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ کەی ئەدەبی هاوەڵان وابووە!!!چۆن لەماڵیدا ئەو ئینکاریە توندە دەکات !!!وەلە گەڵ ئەوەشدا خۆ ئینکاریەکەی هاواری نەکردووە بەدەنگی بەرز لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ چونکە لە ڕیوایەتەکاندا لە هەندێ لە فزدا وەکوو باسمان کرد دەفەرمووێ: ﴿ والنبي ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ متغش بثوبه﴾ سەری پیرۆزی داپۆشیبوو پاشان لە لە فزێکی تردا دەفەرمووێ ﴿ فكشف النبي ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ عن وجهه﴾ واتە لای دا لەسەر سەری پیرۆزی و فەرمووی وازیان لێبێنە ئەی ئەبوو بەکر چونکە جەژنە پاشان فەرمووی ﴿ غمزتهمافخرجتا﴾ تێ ی ژەندن یان بەچاو ئاماژەی دانێ ئیتر چونە دەرەوە دەی ئەوەش بەڵگەیە کە ئەو دووانە منداڵ بوون و بچوك بوون چونکە ووشەی ﴿غمزتهما﴾ بۆ تێژەندن بەکار دێت ئەگەر منداڵ نەبونایە وای نەدەکرد دەربارەیان واتە تێی نەدەژەندن چونکە جائز نیە والله اعلم.

وەپاشان ڕیوایەتی صحیحیش هەیە کە عائیشە منداڵ بووە جەواری هاتوونەتە لای وە یاریان لە گەڵ کردووە هەر وەك ابن جوزی لە ﴿ تلبيس ابليس ﴾ دا دەفەرمووێ ١/ ٢٣٩). ﴿ والظاهر من هاتين الجاريتين صغر السن ، لأنَّ عائشة كانت صغيرة ، وكان رسول الله ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ يسرب اليها الجواري فيلعبن معها ﴾[٨٣]

83 _﴿ رواه الشيخان﴾ وغيرهما وهو مخرج في غاية المرام/ ٩٩/ ١٢٨.

پاشــان لــه بــارەی ئــەم فــەرمووده پــیرۆزه: أبــو طیــب الطــبری دەفـەرمووێ:﴿هـذا الحـديث حجتنـا، لأن أبابكر سمـى ذالـك مزمـور الشيطان ، ولم ينكر النبي﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ على ابي بكر بقولـه ،وإنما منعه من التغليظ في الانكار ليحسن رفقتـه ، لاسيما في يـوم العيد ، وقد كانت عائشة _ رضى الله عنها _صغيرة في ذالك الوقت ، ولم ينقل عنها بعد بلوغها وتحصيلها إلا ذم الغنـاء ، وقد كـان إبن أخيها القاسم بن محمد يذم الغنـاء ويمنع من سماعـة ، وقد أخذ العلم عنها ﴾[84]

کەواتـه کـاتێ ئـەبو بـەکر ڕەزاو ڕەحمـەتی خـوای لێبێـت کـه فـەرمووی مزمور الشيطان پێغەمبەر ﴿ صلى الله عليه وسلم﴾ ئینکاری ئەبوبـەکری لـه سەر ئەوە نەکرد لەبـەر ئـەوە ڕێگـری کـرد کەڕۆژەکـه ڕۆژی جەژنـه وه عائیشەش ڕەزاو ڕەحمەتی خوا له خۆی و باوکی بێت بـچوك بـووە لـەو کاتــەدا ، وەلــه عائیــشەوه ڕەزاو ڕەحمــەتی خــوای لێبێــت لــه دوای پێگەیـشتنی هیـچی لێ وەر نـەگیراوه جگـه لـه زەمـی گـۆرانی نـەبێت ، وەکوڕی برای کـه قاسـم بـن محمـد زەمـی گـۆرانی دەکـات وه ڕێگـری لـه گوێ گرتنـی دەکـات لـه کاتێکـدا یـه کەزانـستی لـه عائیـشەوه وەرگرتـوه ڕەحمەتی خوایان لێبێت ..

وه ابن تیمیه — ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێت دەفەرموێت :

﴿ ففــي هــذا الحــديث بيــان أنَّ هــذا لم يكــن مــن عــادة الــنبي ﴿ صلى الله عليه وسلم﴾ وأصحابه الاجتماع عليه ، ولهذا سماه الصديق _ رضى الله عنه ﴿ مزمور الـشيطان ﴾ والـنبي ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ أقر الجواري عليه معللا ذلك بأنـه يـوم عيـد ، والـصغار يـرخص لهـم

84 _﴿ كتاب ابن الجوزى﴾١/ ٢٥٣~٢٥٤.

في اللعب في الاعياد ، كما جاء في الحديث ﴿ ليعلم المشركون ان في ديننا فسحة ، وكما كان يكون لعائشة لعب تلعب بهن وتجيء صواحباتها من صغار النسوة يلعبن معها﴾[85]

كەواتە لەم فەرموودە دا ڕۆشنە کەئەم ڕووداوە واتە کۆبونەوەی ئەو جەوارپانە لە ماڵی پێغەمبەر﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ لە عادەتی پێغەمبەرو ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ هاوەڵان نەبووە لەبەر ئەو هۆیە بووە ئەبوبەکر ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێت ناوی بردوە بە ﴿مزمور الشيطان ﴾ وە ڕازی بوونی پێغەمبەر﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ لەبەر عیللەتێ بووە کە جەژنە ، وەمنداڵیش مۆڵەت پێدراوە کە یاری بکەن لە جەژنەکاندا هەروەکوو لەم فەرموودەدا هاتوە تاوەکوو موشریکەکان بزانن کە ئەم ئیسلامە سەماحەت و فراوانەو دینێکی میانڕەوە .... پاشان کاتێ ئەبوبەکر _ڕەحمەتی خوای لێبێت _ چۆتە ژورەوە کە ئەوەی بینی پێغەمبەریش ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ بە پۆشاکەکەی سەری پیرۆزی داپۆشیووە وای زانی نوستووە و ڕوی ئینکاری کردە عائیشە _ ڕەحمەتی خوایان لێبێت _ وە دوای ئەوەش پێغەمبەر ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ بۆی ڕوون کردەوە کە ڕۆژی جەژنە بۆیە ئینکاری تیادا ناکرێ هەروەکوو چۆن لە کاتی زەماوەندا ڕەوایە.....

پاشان دەڵێن دیارە ئەوانەی باش لە فەرموودەکە حاڵی نەبوون !!دەڵێن چۆن ئەبوبەکر _ ڕەحمەتی خوای لێبێت _ ئەگەر پێی وابێت گۆرانی و دەف حەڕامە لە ماڵی پێغەمبەردا ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ دەکرێ؟! واتە ئەبو بەکر ڕەحمەتی خوای لێبێت گومانی ئەوەی بردووە لە ماڵی پێغەمبەردا ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ لە بەر چاوی شتی حەڕام کراوەو لێی

---

85 _﴿ رسالە السماع والرقص﴾ ٢~٢٨٥ متفق عليه.

بێدەنگ بووە !! هەر خۆشیان دەڵێن بێ گومان ئەو جۆرە گومانە لە ئەبو بەکر _ ڕەحمەتی خوای لێبێت _ زۆر دوورە !!

ئێمە دەڵێین ﴿ نازانین چۆن قەڵەم لە کاتی شتی وادا لەکار نەکەوتووە ؟!!چ بوێریەکە کە بیرو بۆچونی وا بووترێ ؟!! جارێ پێیش هەموو شتێ ڕوونمان کردەوە کە ئەبوبەکر _ ڕەحمەتی خوای لێبێت _ کاتێ هاتە ژوور وای زانی پێغەمبەر ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ نووستووە !! پاشان دەبێت بزانین ئەگەر ئەو شتە حەڕام نەبوایە لە غەیری ئەو حاڵەتانەی کە باس کران ئەوا ئەبو بەکر _ ڕەحمەتی خوای لێبێت _ شتی وای نە دەووت چونکە ئەبوبەکرو هەموو هاوەڵان ڕەزاو ڕەحمەتی خوایان لێبێت _ ئەدەبیان وا نەبووە کە پێشی پێغەمبەری خوا بکەون ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ هەروەکوو ئەوەی کە پێغەمبەر ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ فەرمانی پێدا کە بمێنێتەوە لە نوێژەکەی وە پێغەمبەر ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ ئیقتدای پێبکات هەروەکوو لە صەحیحەیندا هاتووە دەزانین کە ئەبو بەکر _ ڕەحمەتی خوای لێبێت _ چی فەرموو فەرمووی ﴿ ماكان لابن ابي قحافة ان يصلي بين يدي رسول الله صلى الله عليه وسلم ﴾

کەواتە بە دەلیل و بەڵگە لە لای سەلمێنراوە کە ڕێگە پێدراو نی یە بەلأم پێغەمبەر ﴿ صلى الله عليه وسلم﴾ بۆی ڕۆشن کردەوە کە ئەی ئەبوبەکر لە جەژندا ڕێگە پێدراوە ... پاشان بۆزیاتر بەهێز بوون بەڵگەکانمان و تێگەیشتنی خوێنەرو موسڵمانانی بەڕێز دەڵێین :

کاتێ پێغەمبەر ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ بانگی کوژراوانی موشریکینی کرد لە ﴿ قليب بدر ﴾ کە فەرمووی ﴿ يا فلان ابن فلان ....﴾ وەپاشان امامی عمرو هاوەڵان _ڕەحمەتی خوایان لێبێت کە فەرموویان ﴿ ماتكلم من أجساد لا أرواح فيها ﴾ دەی پێغەمبەر ﴿ صلى الله عليه وسلم

﴾ ئیقراری لە سەر کرد بەلام جوابی دانەوەو فەرمووی ﴿ ما انتم باسمع لما اقول منهم ﴾ [86]

جا ئەگەر استدلالی لێ بکەین لەو ڕوداوە ئاشکرایە دەبینین ئەصل لە مردوودا ئەوەیە کە نابیستێ دەی ئەگەر هاوەلان _ خوا لێیان ڕازی بێت _ لە پێشتر ئەمەیان لە لا سەلمێنراو نەبوایە چۆن وا دەلێن ! چونکە ﴿ انك لاتسمع الموتی﴾ لەلایان سەلمێنراوە بۆیە وا دەفەرموون پاشان پێغەمبەر ﴿ صلی الله علیه وسلم ﴾ دەیەوێ بویان ڕاست بکاتەوە کە ئەمە تایبەتە بەوانەوە هەروەکوو هەموو مردوانی تر ناگرێتەوە وە تایبەتە تەنها بەو حالەتە نەك بەبەردەوامی ببیستن ..

وە لە ڕیوایەتێکی تردا عن أنس ﴿ رضی الله عنه ﴾ قال :﴿ فسمع عمر صوته ، فقال یا رسول الله ﴿ صلی الله علیه وسلم ﴾ أتنادیهم بعد ثلاث؟ وهل یسمعون ؟ یقول الله عزوجل ﴿ إنك لاتسمع الموتی ﴾ فقال والذي نفسي بیده ما انتم بأسمع ﴿لما اقول ﴾ منهم ولکنهم لایستطیعون ان یجیبوا﴾ [87]

دەی کەواتە بۆیە ئاوها ڕاشکاوانە فەرموویانە تاوەکوو ئەو گرفتە لە لایان نەمێنێت ، وە بێگومان پێغەمبەر ﴿ صلی الله علیه وسلم ﴾ دانی پیادا ناوە بۆیان بەلام نەشی فەرمووە ﴿ اخطأتم﴾ هەلەتان کردووە بەلکوو بۆی ڕوون کردونەتەوە و فەرمووی ئێوە باشتر لەوان نابیستن چونکە ئەوە لە لای ئەوان شاراوەیە ، بۆیە ئەمە تایبەتە استثنی دەکرێ لە ئایەتەکەو موعجیزەیەکی پێغەمبەرە ﴿ صلی الله علیه وسلم ﴾ .

---

86 _﴿ متفق علیه ﴾

87 _﴿رواه أحمد ﴾٣~٢٨٧ وسنده صحیح علی شرط مسلم

پاشان هەندێ شوبهە ئەڕەوێنینەوە بە پشتیوانی خوای گەورە کەلەم فەرمووده یەشدا درووستیان کردووه ...﴿ عن نافع مولى ابن عمر ﴿ رضی الله عنه﴾ إنَّ ابن عمر سمع صوت زمارة راع ، فوضع أصبعيه في اذنيه ، وعدل راحلته عن الطريق وهو يقول : يا نافع أتسمع؟ فاقول نعم فيمضي ، حتى قلت :لا فوضع يديه وأعاد راحلته الى الطريق ، وقال : رأيت رسول الله ﴿صلى الله عليه وسلم ﴾ وسمع زمارة راع فصنع مثل هذا﴾ [88]

واتە:﴿ عبد الله ی کوڕی عمر ڕەزاوڕەحمەتی خوایان لێبێت _ گوێ ی لە دەنگی شمشاڵی شوانێك بوو یەکسەر هەردوو پەنجەی خستە گوێکانی و ﴿ واتە گوێ ی گرت ﴾ وە ولاخەکەی لاڕێ کرد و ووتی : ئەی نافع دەنگەکە هەر دەبیستی ؟ منیش دەمووت بەڵێ ، ئیتر هەر دەڕۆی و دوورکەوتەوە ، هەتا ووتم نەخێر ئینجا دەستی بەرداو ولاخەکەی هێنایەوە سەرڕێ وە فەرمووی : پێغەمبەر ی خوام بینی﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ گوێی لە دەنگی شمشاڵی شوانێك بوو بەم جۆرەی کرد . پاشان دەڵێن ئەگەر گوێ لێگرتنی حەرام بوایە ئەوا پێغەمبەر ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ بەڕەوای نەدەبینی ابن عمر گوێی لێ بگرێ وە هەروەها ابن عمریش بە ڕەوای نە ئەبینی ﴿ نافع ﴾ گوێی لی بگرێ !!!! لەوەلامی ئەمەدا ئەڵێین هەروەکوو زانایان ئەڵێن[٧]:

---

88 ﴿ أخرجه احمد ٢/ ٨ و٣٨ وابن سعد (ع/١٦٣ ) وابو داود (٤٩٢٤~ ٤٩٢٦ ﴾ ومن طريقة البيهقي في ﴿ السنن ﴾ ٢٢٢/١٠ ﴾ وكذا ابن جوزي ٢٤٧ ، وابن حبان في صحيحه ٢٠١٣ موارد ن وابن ابي دنيا ق ١/٩ ، والاجري رقم ٦٤ ، والطبراني في ﴿ المعجم الصغير ﴾ ص ٥ ، والبيهقي في شعب الايمان أيضا ٤/ ٢٨٣ / ٥١٢٠ من طريق النافع وهو صحيح

١- بێگومان ئەو شەرح و ڕاڤەی لەو فەرموودە دەكرێ بەو جۆرە زۆر هەڵەیە جارێ پێش هەموو شتێ جیاوازی زۆر هەیە لە بەینی ﴿ السماع﴾ وە ﴿ الاستماع ﴾ جائەوانەی ئەو بۆ چونە هەڵەیەیان هەیە یەكەم ڕاڤە ئەكەن بە دووەم واتە ﴿ سماع بە استماع ﴾ واتە گوێ لێبوون بە گوێ لێگرتن كە ئەمە هەڵەیەكی زۆر گەورەیە جا دەفەرمووێ ﴿ وليس في الحديث الجاريتين ان النبي ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ استمع الى ذلك ، والامر والنهي إنما يتعلق بالاستماع لابمجرد السماع كما في الرؤية ، فإنه إنما يتعلق بقصد الرؤية لاما يحصل منها بغير الاختيار كذلك في اشتمام الطيب إنما ينهى المحرم عن قصد الشم ، فأما إذا شم مالايقصده فإنه لا إثم عليه وكذلك في مباشرة المحرمات كالحواس الخمس من السمع والبصر والشم والذوق و اللمس إنما يتعلق الامر والنهي في ذلك بما للعبد فيه قصد وعمل واما ما حصل بغير اختياره فلا أمر فيه ولا نهي

واتە:﴿ لە فەرموودەی ئەو دوو كچۆڵە بچوكەی لە ماڵی پێغەمبەر ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ گۆرانیان دەووت تیادا نەهاتووە كە پێغەمبەر ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ گوێی لێگرتبن چونكە فەرمان ونەهی واتە امر و نهی پەیوەندی بە گوێ گرتنەوە هەیە نەك تەنها بە گوێ لێبوون هەروەكوو لە بینینیدا ئەگەر بە مەبەستی بینینی شتی قەدەغەكراو بۆ نموونە چاو دەبینێ لە شتێكی وادا كەڕەوا نیە بەڵام بەبێ مەبەستی بینینی واتە مەبەستی سەیر كردنی ئەو شتە قەدەغەیە نی یە بەڵام بەبێ اختیار و دەسەڵاتی خۆی دەیبینێ هەروەكوو ئەوە وایە بۆنیش بۆ كەسێك كە لە ئیحرامدا بێت دەی نەهی لەوەدایە كە بە قصد بێت بە مەبەست بێت بەڵام ئەگەر بەمەبەست و قصد نەبێ ئەگەر بۆنێ هات بەسەریدا ئەوا گوناهبار نابێت هەموو ئەمانە وەكوو

پێنج هەستیارەکە بیستن و بینین و بۆ ن و چەشتن و دەست لێدان دەی ئەمانە امرو نەهی کاتێ پەیوەستە پێیانەوە کە ئینسان بە مەبەست ئیش بکات ، بەلآم ئەگەر بەبێ دەسەلآتی ئەو بێ ئەوا ئەمر و نەهی تێدا نیە﴾ ئەوان گۆێیان لێ نەگرتووە بە لکو گوێیان لێبووە!!

٢_ ابن حزم و هاورایانی وادەزانن کە شوانەکە لە بەر دەستی پێغەمبەربووە ﴿ صلی الله علیه وسلم ﴾ تا فەرمانی پێ بکاو نەهی لێ بکات !! وە لە فەرموودەکەدا شتی وای تیادانیە لە وانەیە لەسەر شاخێك بوو بێت یان لە جێگەیەك بوبێت کە نەیان توانی بێت بچنە لای یان شوانەکە منداڵ بێت و موکەلەف نەبێ وە زۆر لە منداڵان لەو سەردەمەدا شوان بوون یان گوێیان لێ بوبێ و نەیان بینی بێت بۆیە زانای بەناو بانگ ﴿ ابن عبد الهادی ﴾ دەفەرمووێ : پوختەی :﴿وتقرير الراعي لايدل على اباحة لأنها قضية عين فلعله سمعه بلا رؤية أو بعيدا منه على رأس جبل أو مكان لايمكن الوصول إليه أو لعل الراعي لم يكن مكلفا فلم يتعين الانكار عليه ﴾ [89]

٣_بێگومان حەرامی مۆسیقا وەکوو حەرامی عەرەق و خەمرە ، وەهەمووشمان دەزانین پێغەمبەری خوا ﴿ صلی الله علیه وسلم ﴾ تیایاندا ژیاوە کە خەمرو عەرەق خوراوەتەوە دەکرێ بڵێی پێغەمبەر ﴿ صلی الله علیه وسلم ﴾ بێدەنگ بووە و نەهی لێ نەکردووە!!!اجا بۆیە احتمال هەیە ئەوە پێش تحریمی بووبێ وەکوو زانایان دەڵێن ﴿ مع الاحتمال يسقط الاستدلال﴾

٤_ وەگریمان وای دابنێین ئەوە ڕەوا بووە بۆ شوانەکە کە بێگومان وانیە ئەو ئامێرەی کە ئەو بەکاری هێناوە ئامێرێکی سەرەتای بووە کە

---

89 _﴿ عون المعبود﴾ ٤~٤٣٥ وهو عن ﴿ مرقاة الصعود﴾ للسيوطي.

ڕێگەیان بەخۆیان ئەداوە گوێ بیستی ببن چونکە مرۆڤ لە قالبی سرووشتی خوێ تێك ئەدات و لە سنووری سروشتی لادەدات ئەمە لە گوێ و لەم تاثیراتەی ئەمرۆ هەن وەکوو عودو کەمان و قانون و ...هتد لە گوێ؟!! وە بێگومان لیو فەرمووەدیەدا بەلگەکە بەڕۆشنی دیارە کە پێغەمبەر ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ پێی ناخۆش بووە و گوێی لێ نەگرتووە وەکوو ابن عمریش ـ ڕەحمەتی خوایان لێبێت ـ پەێڕەوکاتی خستوتە گوێی ﴿لقد كان لكم في رسول الله أسوة حسنة﴾ ئەمەوە لە کاتێکیشدایە کە بە مەبەستی گوێ گرتن نەبووە کە بێگومان لەکەن بوونی گوێ گرتن خراپترە و حەرامە واتە بە قصد ، ئەمەر ئەوەیە ابن جوزی ـ دەفەرمووێ ل۲۴۷ ﴿ إذا كان هذا فعلهم في الحق صوتٌ لا يخرج عن الاعتدال فكيف بغناء أهل الزمان وزمورهم ؟!! ئێمەش دەڵێین ﴿ ئێمە دەبێت بلێین چی لەم سەردەمەدا بەوانەی ئەهلی مۆسیقاو گۆرانین بە چەندەها ئامێر دەژەنن کە پیرە مێردو پیرێژنیش لە اعتدال دەردەکات !!؟ فهل من معتبر!!!!!!!!
من ئازانم ئەوانەی گۆرانی و مۆسیقای ئەمرۆ کە مرۆڤ ئەیژەنن بە عودو کەمان و قانون ـ هتد چۆن هەندێ لە زانایان ڕێگەی پێدەدەن لە ناێ کاتی فەتوایە دەدری نابێ ڕەچاوی حاڵ و باری خەلکی بکرێ !! مەگەر بە صحیحی لە عائیشەوە نەهاتووە ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ کە دەفەرمووێ ﴿ لَوْ رَأَى رَسُولُ اللهِ ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ مَا أَحْدَثَ النِّسَاءُ بَعْدَهُ لَمَنَعَهُنَّ الْمَسَاجِدَ كَمَا مُنِعَتْ نِسَاءُ بَنِي إِسْرَائِيلَ ﴾[90]
پاشان ڕیوایەتێکی تر کەدەیکەنە بەلگە ی بەکار هێنانی دەف و گۆرانی بە ڕەهای دەڵێن دروستە بەکار بێت هەمیشەو بەبێ ئەوەی پەیوەندی

90 _ ﴿ رواه مالك و البخاري ومسلم وابوداود.

بـە هـیچ موناسـەبەیەكەوە هـەبیٚ!! ئـەم ڕیوایەتـە دەكەنـم بەلگـە :﴿ _فعن عَبْدِالله بن بريْدة قَالَ:سمعتُ بريْدةَ يقولُ :خَرَجَ رسولُ الله ﴿صلى الله عليه وسلم﴾ في بعضِ مغازيه ، فَلَما انْصرَف جاءَتْ جاريَةٌ سَوْداءُ فَقَالَتْ:يَا رسول الله إني كُنْتُ نَذَرْتُ إنْ رَدَّك اللهُ سالماً أنْ اضْرب بيْنَ يدَيْك بالدُّف وَاتَغنَّى ؟ فَقَالَ لَهَا رسُولُ الله ﴿صلى الله عليه وسلم﴾ إنْ كُنْت نَذَرْتِ فَاضْربِي، وَإلاَ فَلاَ ،فَجَعَلَتْ تَضْربُ ، فَدخَلَ أبو بَكْرٍ وَهِي تَضْرِبُ ، ثُمَّ دَخَلَ عَلِيٌّ، و هي تَضربُ ، ثُمّ دَخَلَ عُثْمَانُ وَهِيَ تَضْرِبُ ، ثُمَّ دَخَلَ عُمر ، فَأَلْقَتْ الدُّفَّ تَحْتَ اسْتِهَا، ثُمَّ قَعدَتْ عَلَيه، فَقَالَ رسُولُ اللَّه﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ :﴿ إنَّ الشَّيْطَانَ لَيَخَافُ مِنْك يَا عُمَرُ ، إنِّي كُنْتُ جَالساً و هِي تَضْربُ ، فَدخَل أبوبَكْرٍ وَهِي تَضْرِبُ ثُمَّ دَخَلَ عَلِيُّ وَهِي تَضْرِبُ ، ثُمَّ دَخَلَ عُثْمَانُ وَهِي تَضْربُ ، فَلَمَا دَخَلْتَ أَلْقَت الدُّفَّ ﴾[91]

پوختەی : ﴿ ئەم ئافرەتە كە نـەزری كردبوو ئەگەر پێغەمبـەر ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ بەسەلامەتی بگەڕێتـەوە دەف لێبدات و گۆرانی بلێت لە ڕیوایەتەكەدا دەفـەرمووێ : ئـەی پێغەمبـەر ﴿صلى الله عليه وسلم﴾ مـن نەزرم كردبوو كەئەگەر بەسـەلامەتی بگەڕێتـەوە ئـەوا لەبـەر دەمتـدا دەف لێبدەم و گۆرانی بلێم پێغەمبـەر ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ فـەرمووی چی ؟ إن كنت نذرت فاضربي وإلا فلا ....

واتە : ئەگەر نەزرت كردووە ئەوە باشە بەلام ئەگەر نـەزرت نـەكردووە ئـەوا لێـی مـەدە بـە ڕۆشـنی دیـارە كـە دەفـەرمووێ : ئەگـەر نـەزرت

91 _﴿ الترمذي ، كتاب المناقب ، باب حدثنا الحسين بن حريث ، برقم ٣٦٩٠ ، وابن عساكر ، ٣٣٨/١ وصححه الالباني في صحيح الترمذي ٣/ ٥١٢ ، وفي سلسلة الاحاديث الصحيحة ، برقم ٢٢٦١.

نـەکردووە شـتی وا مەکـە دەی ئەگـەر بـەڕەهای دروسـت بوایـە دەف و گـۆرانی ئـەوا وای نەدەفـەرموو﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ ئەگـەر نـەزرت نـەکردوە مەیکـە ، پاشـان زانایـان پێیـان وایـە ئەمـە تایبەتـە بـە پێغەمبـەری خـواوە ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ چـونکە خۆشـی دەربـڕین بـە گەڕانــەوەو ســەلامەتی پێغەمبــەر ﴿صـلى اللــه عليــه وســلم ﴾ لــە هەمووخۆشـیەکانی تـر زیـاترە و بـەڵکو هـیچ خۆشـیەك نایگـاتێ ، وە إمــامی الخطــابي _ ڕەحمــەتی خــوای لێبێــت _ دەفــەرمووێ: ﴿ ضـرب الـدف لـيس ممـا يعـد في بـاب الطاعـات الـتي يتعلـق بهـا النذور ، واحسن حاله ان يكون من باب المباح ، غير انه لما اتـصل بإظهار الفرح بسلامة مقدم رسـول الله ﴿ صلى الله عليه وسلم﴾ حين قدم المدينـة مـن بعـض غزواتـه ، وكانـت فيـه مـساءة الكفـار وإرغـام المنافقين صار فعلـه كـبعض القـرب الـتي مـن نوافـل الطاعـات ولهـذا ابيح ضـرب الـف ﴾ والله اعلم [٩٢]

پاشـان ئەگـەر بـوترێ ئـەوا زانیمـان لـەو فەرموودانـە دا و لـە ووتـەی زانایان بۆمان دەرکەوت کە ئامێرەکان حەڕامن جگە لە دەف ئەویش لە زەماوەنـدو دوو جەژنەکـە ئایـا مناسـەبەیەکی تـر هەیـە هـەتاکو دەفـی تیادا بەکار بێت ؟ ؟

دەڵێین :﴿ بە پشتیوانی خوا ﴿ جل جلاله﴾ ڕونمـان کـردەوە لـەوەو پـێش وە ئـەو شـوبهانەمان بـاس کـردو ڕەواندمانــەوە وە چـەند ڕیوایـەتێکی تـریش هــەبوون کــە دەیکەنــە بەڵگــە بێگومــان لەبــەر (ضــعیفی﴾ ڕیوایەتەکان نەمان هێنا ، لێرەدا هەندێ دەڵێن لە کاتی ﴿ختان﴾ واتـە خەتەنەکردن و لە گەڕانەوەی غائب دروستە و بەکار هاتووە ئـەی ئـەم

92 _إمام الخطابي في معالم السنن ٤/ ٣٨٢.

دوو بەڵگەیە چین ؟؟ ئەو دوو بە لگەیەی کە دەیکەنە دەلیل یەکەمیان ئەو فەرموودەیەی پێشوو بوو کە باسمان کرد و ڕەواندمانەوە چونکە ئەوە تایبەتە بە پێغەمبەر ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ ومڕونمان کردەوە .

وە دووەمیان کەبە ڕەوای دەبینن لە خەتەنەکردندا بەبەلگەی لە ﴿مسألة السماع ص~ ١٣٣~ کەدەفەرمووێ:﴿ اثرا من رواية ابي شعيب الحراني بسنده عن خالد عن ابن سيرين أن عمر بن الخطاب كان اذا سمع صوت الدف سأل عنه ؟ فإن قالوا عرس أو ختان سكت ورجاله ثقات ﴾

واتە:﴿ ئەگەر إمامی عمر ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێت گوێ ی لە دەنگی دەف بوایە پرسیاری دەکرد ئەگەر بیانوتایە زەماوەندە یان خەتەنەکردنە بێدەنگ دەبوو ﴾ ئەم ڕیوایەتە پچڕاوی هەیە واتە ﴿منقطع﴾ە دەڵێ عن ابن سيرين ان عمر ............الخ ﴾

دەی ئەمەزۆر ڕۆشنە کە محمد بن سيرين نەگەیشتۆتە عومەری کوڕی خەطاب بەڵکوو محمدی کوڕی سیرین لە دوای وەفاتی امامی عمر لە دایك بووە ڕەزای خوایان لێبێت بە دەوری بیست ساڵ!!!! والله اعلى وأعلم.

پاشان هەندێ دەڵێن باشە ئەگەر دەنگی خۆشی بولبول و ئاوازی باڵندەکان ڕێگە پێدراو بن !!!! بۆ دەبێت دەنگی خۆشی مرۆڤ و ئاوازی ناسکی قەدەغەو حەرام بێت !!! دەڵێن لە کاتێکدا هەردووکیان هەر لە قورگەوە دەردەچن !!! پاشان ئەم ووتەیەی غەزالی دێنن و دەڵێن امامی غەزالی دەفەرمووێ:﴿ فالأصل في الاصوات حناجر الحيوانات ، وانما وضعت المزامير على اصوات الحناجر ، وهو تشبيه للصنعة بالخلفة التي استاثر الله تعالى باختراعها ، فمنه تعلم الصناع وبه قصدوا الاقتداء.......... فسماع هذه الاصوات يستحيل ان يحرم

لكونهـا طيبـة موزونـة ، فـلا ذاهـب الى تحـريم صـوت العنـدليب ، وسـائر الطيـور ، ولا فـرق بـين حنجـرة و حنجـرة ، ولابـين جمـاد وحيـوان ، فينبغـي ان يقـاس علـى صـوت العنـدليب الاصـوات الخارجة من سائر الاجسام باختيار الادمي ، كالذي يخرج من حلقه او من القضيب والطبل والدف وغيره ﴾ [٩٣]

بێگومان ئەمە قیاسێکی زۆر لاوازو بێ بەڵگەیە بەڵام لەمەش خراپتر دەڵێین وەکو بەحەلاڵ دانانی سەر خۆش کەر !!! بەڵام وەڵامی ئەوە بەوە دەدەینەوە کەوەکو ایاسی کوڕی مەعاویە جوابی کابرای دایەوە لەسەردەمی خۆیدا کە دەڵێ : ﴿ أن رجلا قال له ماتقول في الماء ؟ قال حلال، قال فالتمر ؟ قال حلال ، فالنبيذ ماء وتمر فكيف تحرمه ؟!!! فقال له اياس ارأيت لو ضربتك بكف من تراب أكنت أقتلك ؟ قال لا قال فإن ضربتك بكف من تبن أكنت أقتلك ؟ قال لا ،قال فإن ضربتك بكف من ماء أكنت اقتلك ؟ قال لا قال فإن أخذت الماء والتبن والتراب فجعلته طينا وتركته حتى يجف وضربتك به أكنت أقتلك ؟ قال نعم قال كذالك النبيذ ﴾ [٩٤]

جائەوانەی قیاسی وادەکەن باتڵە وەکو کابرا ووتی چ دەڵێی دەربارەی ئاو؟ فەرمووی حەلاڵ و ڕێگە پێدراوە ، کابرا ووتی ئەی خورما ؟ فەرمووی حەلاڵە ووتی باشە شەراب لە خورماو ئاو پێك دێت چۆن حەرامی دەکەیت ؟!

إیاس پێ ی فەرموو ﴿ ئایا ئەگەر چنگێ خۆڵت پیا بکێشم دەتکوژێ ؟ کابرا ووتی نەخێر فەرمووی ئەی ئەگەر بە چنگێ کا لێت بدەم

---

93 _﴿ احياو علوم الدين ~ص ١١٣٦ طبعة المنصورة﴾

94 _رواه ابن عساكر٣/ ٣٣٠ ~٣٣١من طريق ابن ابي دنيا

دەتكوژێ ؟ ووتی نەخێر ، فەرمووی ئەی بە چنگێ ئاو لێت بدەم دەتكوژێ ؟ كابرا ووتی نەخێر ، فەرمووی باشە ئەگەر ئاو و گڵ و كا تێكەڵ بكەی و بیكەی بە قوڕ دوایی دایبنێ ی تاووشك ئەبێتەوە پاشان لێتدەم پێ ی ئایا ئەتكوژێ ؟ كابرا ووتی بەڵێ فەرمووی دەی شەرابیش وایە

بۆیە ناكرێ قیاسی دەف بكەیتە سەر ئامێرەكانی ترو بە حەلاڵی دابنێ ی !!! یان كارێك تایبەت بێت بە بۆنەكان تۆ بڵێ ی مادام لەو حاڵەتەدا دروستە لەهەموو كاتێكدا دروستە !!!وە قیاسی دەنگوو ئاوازی تەیرو بولبول بكەی بە ئاوازی گۆرانی و مۆسیقا !!! چونكە دەنگی بولبول و تەیرو ....هتد دەنگی أصلی خۆیەتی و بەوە مەشهورە ئەگەر ئەو ئاوازانەیان نەبێت پێیان ناوترێ بولبول و.....هتد بەلاَم تۆی مرۆڤ بە دەنگێ مەشهوری كەلەگەڵ قاڵبی سروشتیدا بگونجێ كە ئەویش دەنگی قورئانی پیرۆزە چۆن بولبول وتەیر بەوە دڵ ئارام دەبێت كە بخوێنێ ئاوەهاش مرۆڤ بە قورئان خوێندن دڵ ئارام دەبێت والله اعلم .

## ﴿ حوكمی گۆرانیە بێ ئامێرەكان﴾

كاتێ ڕۆشنبووەوە كە مۆسیقاو گۆرانی حوكمی حەڕامیان هەیە تەنها دەف نە بێت ، ئەی حوكمی گۆرانی بێ ئامێرەكان چۆنە؟

بۆ وەلاَمی ئەوە دەڵێین هەروەكوو زانایان دەفەرموون ڕەحمەتی خوایان لێبێت هەندێ گۆرانی موباحن ناتوانین بڵێین حەڕامە بەڕەهای هەروەكوو چۆن ناتوانین بەڕەها یی بڵێین حەلاڵە ، چونكە گۆرانی سەرچاوەكەی هۆنراوەیەو شیعرە ، هۆنراوەش بێگومان چاكی چاكەو خراپی خراپە هەروەكوو چۆن پرسیاریان كرد لە پێغەمبەر ﴿

صلى الله عليه وسلم ﴾ لەبارەی شیعرەوە فەرمووی ﴿ هُو كَلاَم ، فَحَسَنُهُ حَسَنْ ، وَقَبِيْحُهُ قَبِيح ﴾[95]

واته:﴿ هۆنراوە بریتیە لە قسەو ووشە چاكی چاكەو خراپی خراپە ﴾ وەهەروەها دایكمان عائشە ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێت دەفەرمووێ :﴿ خذ بالحسن ، ودع القبيح، ولقد رويت من شعر كعب بن مالك أشعارا منها القصيدة فيها اربعون بيتا ودون ذالك ﴾ [96]

پێویستە سەیری ماهیەتی بكەین ئینجا بڕیاری حەڕام یان كەڕاهەت یان حەلاڵ بدەین جا گۆرانیش ئەگەر چاك بوو پاك بوو دروستە بە مەرجێ بێ ئامێر بێت و ڕەچاوی شەرعی تیادا بكرێت كە دەڵێین بە بێ ئامێر واتە جگە لە دەف ، شێخ البانی ڕەحمەتی خوای لێبێت دوای ئەوەی چەند بەلگەیەك باس دەكات دەفەرمووێت :﴿ وفي هذه الاحاديث والاثار دلالة ظاهرة على جواز غناء بدون آلة في بعض المناسبات كاتذكير بالموت ، او الشوق الى اهل والوطن أو الترويح عن النفس وإلى التهاء عن وعثاء السفر ومشاقه ونحو ذالك مما لايتخذ مهنة ولا يخرج به عن حد الاعتدال فلا يقترن به الاضطراب وتثني والضرب بالرجل مما يخل بالمرؤة كما في الحديث أم علقمة مولاة عائيشة :﴿ انَّ بَنَاتَ أخي عَائِشَةَ رَضِيَ الله عَنْهَا خُفِضْنَ فَألمْنَ ذَلِكَ فَقِيلَ لِعَائشَةَ يَا أمَّ المؤمنِينَ الا نَدْعُو لَهُنَّ مِنْ يُلَهِّيهِنَّ ؟ قَالَتْ:بلى، قالت: فأُرْسِلَ الى فُلاَنِ المُغَنِّي فَأتَاهُم فَمَرَّتْ بِه عائشة رضي الله عنها في البَيتِ ، فَرَآتْهُ يَتَغَنَّى وَيُحَرِّكُ رَاسَهُ طَرَباً وَكَانَ ذَا

---

95 _ وهو مخرجة في الصحيحة ٤٤٧.

96 _﴿ الصحيحه﴾

شَعْرٍ كَثِيرٍ فَقَالَتْ عائشَةُ رضـي الله عنهـا  افٍ شَيْطَانٌ !! اخْرِجُـوهُ ، اخْرِجُوهُ ﴾[٩٧]

واتـه:﴿ لـەم بەڵگانـەدا لـەم فـەرموودەو ئـه ڤـه رانـه دا بەڵگـەی ئاشكرای تیادایه كه لەسەر ڕێگه دان به گۆرانی به بێ ئامێر له هەندێ بۆنەدا وەكو یاد خستنەوەی مردن ، یان شەوق و پەرۆشی بۆ كەسوكارو نیشتمان یان بۆ حەواندنـەوەی نـەفس یـان بۆسـووك بـون و دەركردنـی هیلاكـی و سـەفەر ونمونـەی وەكـو ئەوانـە بـەلاّم نەكرێتـە پیـشه وه لـه ئاستی إعتـدال و سروشـتی دەرنەچـێ وه هەنـدێ شـتی لەگەڵـدا نـەبێ كەزەرەر بدات لـه پیـاوەتی ومروئـەتی ئینـسان وەكـو پێـدان بەزەویـداو خۆ لەقاندن و........هتد تاكۆتای ڕیوایەتەكەی عائیشه ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێت  كەواته دەبێـت لـه سروشـتی خـۆی دەرنـەچێ وەبێگومـان بەڵگـه زۆرن بـه پـشتیوانی خـوای تعـالی جـل جلالـه باسـی هەنـدێكیان دەكەین لەوانه:﴿ عن عبدالله بن عباس ﴿رضى الله عنهما﴾ قال:﴿ أنكحت عائشة ذات قرابـة لهـا رجـلا مـن الانـصار فجـاء رسـول الله ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ فقال اهديتم فتاة؟ قالوا نعم ، قال أرسلتم معها مـن يغـني ؟! قالت لا فقال رسول الله ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ ان الانصار قوم فيهم غزل فلو بعثتم معها من يقول أتيناكم أتيناكم فحينا وحياكم ﴾[٩٨]

وەله ڕیوایەتێكی طه به رانـی لـه الاوسـط بـەژماره ٣٢٨٩ دەفـەرمووێ : ﴿ عـن عائـشة أن الـنبي ﴿ صـلى الله عليـه وسـلم ﴾ قـال مافعلـت فلانـة ؟

---

97 _ اخرجه البيهقي ١٠/ ٢٢٣~٢٢٤، والبخاري مختصراً في الادب المفرد ١٢٤٧ بسند حسن ، وصححه الحافظ ابن رجب في ﴿نزهة السماع﴾ ص ٥٥.

98 _ ﴿ اخرجه ابن ماجة  والطحاوي واحمد والنسائي والبزاز والبيهقي وابو شيخ وهو حسن

ليتيمة كانت عندها فقلت اهديناها الى زوجها قال فهل بعثتم معها بجارية تضرب بالدف وتغني قالت تقول ماذا ؟! قال، تقول:

أتيناكم أتيناكم     فحيونا نحيكم

لولاذهب الاحمر     ماحلت بوادكم

لولا حبة سمراء     ماسمن عذاريكم

واته: ﴿جاريكيان عائشه رەحمەتی خوای لیبیت ئافرەتیکی خزمی خۆی مارە کردبوو واتە سەرپەرشتی مارە کردنەکەی کردبوو لە پیاویکی ئەنصاری جا پیغەمبەر ی خوا ﴿ صلی الله علیه وسلم ﴾ هاتەوه فەرمووی کچەکەتان بەرێ کرد ؟ وتیان بەڵێ ، فەرمووی کەستان لەگەڵ نارد گۆرانی بڵێ عائیشه ووتی نەخێر ، پیغەمبەر ﴿ صلی الله علیه وسلم ﴾ فەرمووی ئەنصاریەکان خەڵکێکن کەیفیان بە گۆرانی وتن دێت ئەگەر یەکێکیان لەگەڵ بناردایە بیوتایە هاتینە لاتان هاتینە لاتان وە لە ریوایەتێکی طە بە رانی بەم جۆرەیە :﴿ عائیشە رەزای خوای لیبێت دەفەرمووێ : پێغەمبەری خوا ﴿صلی الله علیه وسلم ﴾ هاتەوه فەرمووی فلاّن ئافرەت چی کرد؟ کەمەبەستی کچێکی هەتیوو بوو لە لای عائیشە بوو منیش ووتم بردمان بۆ مێردەکەی بە بووکی فەرمووی ئەی بۆچی کچێکتان لەگەڵ نەنارد کە دەفی لێبدایەو گۆرانی بوتایە ؟ ئەویش فەرمووی جا چی بوتایە ؟ فەرمووی بیوتایە

هاتینە لاتان هاتینە لاتان

سلاّومان لێبکەن سلاّوتان لێدەکەین

وە ئەگەر ئاڵتونی سوور نەبوایە

دەشت و دۆڵەکانتان بێ لەوەڕوبێفەڕدەبوون

وە ئەگەر دەغڵی بۆر نەبوایە

ڕومەتەکانتان قەڵەو نەدەبوو

بەلأم دەبێ ئەوە بزانین کە دەف لێدان تـەنها بـۆ ئافرەتانـە نـەك پیــاو !!! وەزۆرینــەی کاتــەکان کــچۆڵەی بــچکۆلە دەفیــان لێــداوە لــە بۆنەکانــدا والله اعلــم وەپاشــان ئەمانــەی کــەباس دەکــرێن هــەموو لــە بۆنەکاندا بووە وەکوو بەڕۆشنی لـە ڕیوایەتەکانـدا دیارە وە تـەنها دەف ڕێگە پێدراو بووە والله اعلی واعلم ، پاشـان ڕیوایـەتێکی تـر کـە بەڵگـەو دەلیلی تیادایە کە جگەلە لە بۆنەکان ڕەوانیە ئـەم فەرموودەیـە: ﴿ عـن عامر بـن سـعد البجلـي قـال دخلـت علـى أبـي مـسعود و قرضـة بـن كعب وثابت بن يزيد وجـوار يـضربن بـدف لهـن ويغنين فقلـت تقتـرن هذا وأنـتم أصـحاب رسـول الله ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ قـالوا أنـه رخـص لنا في الغناء وفي العرس والبكاء على الميت في غير نوح﴾ [99]

واتە :﴿ عامری کوڕی سەعدی بە جەلی دەفەرمووێ: ﴿ چومە لای ابـی مسعود و قریظە ی کوڕی کەعب وثابتی کوڕی زەید لە کاتێکدا بوو کە چەند کیژۆڵەیەك دەفیـان لێـدەدا وەگۆرانیـان دەوت ، منـیش ووتم ئایـا ئێوە دان بەمەدا دەنێن ئێـوەش هـاوەڵانی پێغەمبـەری خـوان ﴿ صلى الله عليه وسلم﴾ ؟!

ووتیـان ئێمـە مۆڵـەت دراویـن کـە لـە کـاتی زەماوەنـدا گـۆرانی هـەبێ و گریانیش هەبێت لەسەر مردوو بەبێ خۆ دارنین و هتد .

ڕون کردنەوەیەك:

ئەگەر سـەرنجی ووشـەی ﴿ رخـص ﴾ بـدەین ئـەوە دەگەیـەنێ کـە ڕێگـە پێـدراو نیـە جگـە لـەو کاتانـەی کـەباس کـران ئـەوەتا بەسـەر سوڕمانەوە دەفەرمووێ : چۆن بێدەنگی لـە شتێکی ئـاوا دەکرێـت ئێـوە

99 _ أخرجه الطبراني في الكبير وعبد الباقي بن قانع في معجم الصحابة ، وأخرجه البيهقي باسناد صحيح وأخرجه الحاكم

هـاوەڵانی پێغەمبـەری خـوان ﴿ صـلی الله علیـه وسـلم ﴾ ؟! ئـەوەی لێـوە وەردەگیرێ کـە هـاوەڵانی پێغەمبـەر ﴿ صلی الله علیه وسلم ﴾ لایـان ڕۆشـن بـووە کـە ڕێگـە پێـدراو نیـە !!! پاشـان ئـەوانیش دەفـەرموون مۆڵـەت دراویـن ﴿رخـص﴾ لـە کـاتی زەماوەنـدا کەواتـە ئێمـەش کـە بێـدەنگین کاتەکـە بۆنەیـەو جـائیزە ، وەابـن حـزم خـۆی دەفـەرمووێ ﴿ لاتكـون لفظة رخصة الا عن شيء تقدم التحذير منه ﴾

واتـە : ووشەی مۆڵـەت دان تـەنها دەربـارەی شـتێك دەوترێـت کـە پێشتر نـەهی لێکرابێـت لـە کردنـی ، وە لـە صـە حیحەینیـشدا هـاتووە لـە ئەنەسەوە ڕزاو ڕەحمەتی خوای لێبێت ﴿ أنَّ النَّبِيَّ ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ رَخَّص لعَبْدالرَّحْمن بْنِ عَوفٍ والزبير في قَميص مِن حَرِيرٍ مِن حِكَّةٍ كَانَتْ بِهِماَ﴾ وە لە ڕیوایەتێکی تر ﴿أن عبـدالرحمن بن عـوف والـزبير شَـكَوالى النَّبِـي ﴿صلى الله عليه وسلم ﴾ يَعْنِـي القَمْـل فـأرخَصَ لَهُمَـا في الحَرِيرِ ﴾

واتـە: ﴿ پێغەمبەری خوا ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ مۆڵـەتی عبـدالرحمن کـوڕی عـوف و زوبـێری دا کـەوا قەمیـسی ئاوریـشم لەبـەر بکـەن لەبـەر خورین و حەساسیەت کە لە گەڵیاندا بوو

کەواتە خۆی ڕێگە پێدراو نیە بەڵام مۆڵەت دراون لەبەر ئەو عیلەتە .

وە لە ڕیوایەتێکی تردا ﴿عن سائب بن يزيـد قـال : بينـا نحـن مع عبـدالرحمن بـن عـوف في طريـق الحـج ونحـن نـؤم مكـة اعتـزل عبـد الرحمن الطريق ثم قال لرباح بن المغترف غنينـا ياأبا حسـان وكـان يحسن النصب فبينا رباح يغنيه أدركهم عمر بن الخطـاب في خلافـة فقال ماهذا؟ فقال عبد الرحمن مابأس بهـذا نلهو ونقصر عنـا فقـال

عمر فإن كنت أخذ فعليك بشعر ضرار بن الخطاب  وضرار رجل من بني محارب بن فهد ﴾[100]

واته:﴿ سائيبی كوڕی يەزيد دەفەرمووێ لە كاتێكدا كە لەگەڵ عبد الرحمن كوڕی عەوف لەڕێی حەجدا بووين بەرەو مەككە عبد الرحمن لەڕێ لايدا وپاشان بەڕەباحی كوڕی موغتەريفی ووت ئەی ئەبا حەسان گۆرانيمان بۆ بڵێ كەگۆرانی نەصبی باش دەزانی جا لەكاتی گۆرانی وتنی ڕەباحدا عومەری كوڕی خەطاب كە لەسەردەمی خەلافەتی خۆيدا بوو پێيان گەيشت و ووتی ئەوە چيە؟ عبد الرحمن يش فەرمووی ئەمە هيچ گرفتێكی تيادا نيە خۆ دەخلآفێنين و ڕێيەكەمان كورت دەكەينەوە عومەريش فەرمووی جا ئەگەر شيعر هەڵدەگری و دەيڵێی ئەوا هی ضراری كوڕی خەطاب بڵێ ضيراريش پياوێك بوو لە هۆزی مەحاريبی كوڕی فهر .

وەلەبارەی ﴿نصب﴾ ئەلبانی ڕەحمەتی خوای لێبێت دەفەرمووێ:﴿ ضرب من الاغاني الاعراب وهو يشبيه الحداء﴾ دەفەرمویٚ أبو عبيد الهروری وای فەرمووە واتە چۆن كورد حەيرانی هەيە ئەويش بەو جۆرەيە والله اعلم .

پاشان إبن جوزی بەسەنەدێك لە ئەبی حامد ی خولقانی دەگێڕێتەوە كە دەڵێ ووتم بە إمامی أحمدی كوڕی حەنبەل :

﴿يأبا عبدالله هذه قصائدالرقاق التي في ذكر الجنة والنار أي شيء تقول فيها ؟ فقال مثل أي شيء ؟ قلت يقولون :

إذا ماقال لي ربي          أما أستحييت تعصيني

وتخف الذنب من خلقي     وبالعصياني تاتيني؟!

---

100 _﴿ اخرجه البيهقي ٢٢٤/١٠ باسناد جيد

فقال أعد علي ، فأعدته عليه فقام ودخل بيته ورد الباب فسمعت نحيبه من داخل البيت وهو يقول ﴿فذكر البيتين﴾
ئەمە لە کاتێك پرسیار لە امام أحمد دەکات دەفەرمووێ چی دەڵێی لەبارەی ئەو شیعرانەی کە باسی بەهەشت و ئاگر ئەکات ؟ فەرمووی وەکو چ شتێك ؟ ئەمە بەڕاستی وەرعی زانایان هێمنیان لە فەتوا دەردەخات نەك وەکوو خەڵکانێك یەکسەر بەرەهای فەتوا دەدەن !!
فەرمووی کەکاتێ خوای تعالی جل وعلا دەفەرمووێ ئەی بەندەکەم ئایا شەرم ناکەیت کە سەرپێچیم دەکەیت ، وەگوناهو تاوانەکانت لە خەڵکی دەشاریتەوە و بەسەر پێچی دێیتەلام .؟!
دەفەرمووێ إمام أحمد فەرمووی دووبارەی بکەرەوە ! دەفەرمووێ دووبارەم کردەوە  پاشان هەستاو چووە ژوورەوە گوێم لێبوو دەگریاو پێی خۆش بوو دەیوتەوە . خوێنەری بەڕێز : ئەمانە هیچی لەسنووری سروشتی خۆی دەرنەچوون و إعتداليان پێوە دیارە و ڕۆشنە هەموو گۆرانیەکانیان بیر خستنەوەی مردن و بەهەشت و ئاگر و وەسفی کەعبەو زەمزەم و ....هتد بوون . بۆیە دەڵێین والله ئەو شیعرەی ئێستا باسمان کرد خوێنەر حەز دەکات چەند جار بیلێتەوە و لەبەری بکات چونکە هەموویان هەژاندنی دڵیان تیایە  وەبیر خستنەوەی قیامەت و حیساب و کیتاب و ترسی خوای تعالی وجل جلالە ..هتد تێدایە .لە فەرموودەیەکی تردا لەفەرموودەی سەلمە بنی الاکوع قال:﴿خَرَجْنَا مَعَ رسُول الله﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ إلى خَيْبَر فَسرنَا لَيْلًا فَقَالَ رجُل مِن القَومِ لِعَامر بنِ الاكْوع ألا تَسْمَعنَا مِنْ هُنَايَاتِك ؟ وَكَانَ عَامر رجُلاً شَاعِراً فَنَزلَ يَحْدُو بِالقَومِ يقول :

اللهم لَوْلَا أنْتَ مَا اهْتَدَينَا          وَلَاتَصَدَّقْنَا وَلَاصَلينا
فألقي سَكِينَة عَلَينَا          وَثَبِتِ الاقْدَامَ إذلاَقينا

فَقَالَ رسول الله ﴿ صلى الله عليه وسلم﴾: ﴿مَنْ هَذَا السَائِق؟ قَالوا عَامر بن الاكوع ، فقال: يَرْحَمُهُ الله ﴾
وه هەروەها ئیمامی شافیعیش ڕەحمەتی خوای لێبێت دەفەرمووێ:﴿ أمَا الأسْتمَاع الحداء ونَشيِد الاعْراب فَلاَ بَأس بِهِ﴾
واته:﴿ گوێگرتنی حەداو سرودە ئەعرابیەکان قەیناکە ﴾

لەڕیوایەتێکی تردا :﴿ عن عبدالله بن عباس ﴿رضى الله عنهما﴾ انه بينما هو يسير مع عمر ﴿ رضى الله عنه﴾ في طريق مكة في خلافته و معه المهاجرون والانصار فترنم عمر ببيت فقال رجل من أهل العراق ليس معه عراقي غيره غيرك فليقولها يا امير المؤمنين فاستحيا عمر من ذالك وضرب راحلته حتى انقطعت عن ركب ﴾[١٠١]

واته :﴿ عبدالله کوڕی عباس خوا لە خۆی و باوکی ڕازی بێت دەفەرمووێ لە کاتێکدا لەگەڵ عمردا بووین ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێت کە لە ڕۆژگاری خەلیفایەتی خۆیدا بوو بەرەو مەککە دەچوین کە کۆچ کەران و پشتیوانانی لە گەڵ بوو ، امامی عمر ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێت هۆنراوەیەکی بەشێوەی گۆرانی ووت کابرایەکی عێراقیش کە جگە لەو عێراقی تری لەگەڵ نەبوو ووتی ئەی ئەمیری ئیمانداران بایەکێکی تر ئەوە بڵێت ئیتر امامی عمریش ڕەحمەتی خوای لێبێت بەو قسەیە شەرمی کرد و وولاخەکەی دەنگدا تالەکاروانەکە دابڕا﴾
بێگومان ئەمانە ڕێگە پێدراون بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەمانە بەلگەن کەس ئینکاری نەکردوون بەلاّم دەبێت لە مەشدا کەڕەوایە ﴿ مروئەتی ﴾ تیادا پارێزراو بێت ، چونکە ئەگەرسەرنج بدەیت کە کاتێ کابرای عێراقی بە ئیمامی عومەری فەرموو غەیری تۆ بیوتایە باشتر

---

101 _﴿ أخرجه البيهقي باسناد الصحيح

بوو ماناى ئەوەيە ڕەوايە بەلاَم بۆ پاراستنى زياترى مرۆڤايەتى كەسێكى تر بيلێ باشترە وەئيمامى عومەريش ڕەزاى خواى لێبيت لە كابراى عێراقى تورە نەبوو چونكە سەفەرێكى دوور بۆ كورت كردنەوەى هەندێ جار يان بۆ گورج كردنەوەى كاروانەكە هۆنراوەو گۆرانى ووتراوە بۆيە ئيمامى عمر ڕەحمەتى خواى لێبێت كاتێ شەرمى كرد لەبەر ئەوە نەبوو كەڕەوانيە چونكە بێگومان ئەگەر ڕەوا نەبوايە ئەوا نەيدەوت بەلاَم قسەى كابراشى بەلاوە خراپ نەبوو چونكە وەكوو ئيمامى شافيعيش دەفەرمووێ:﴿ لو علمت أن الماء البارد ينقص مروءتي ماشربته إلا حارا ﴾

واتە:﴿ ئەگەر بزانم كە ئاوى سارد لە مرۆڤەتم كەم دەكاتەوە ئەوا نايخۆمەوە و هەر ئاوى گەرم ئەخۆمەوە !!! ئەى خەلكى ئێمە كەى شەرم دەكات كەسالێ ڕۆژى لێناڕوات لە تەلەفزيۆن و ڕادوێكانەوە مۆسيقاو گۆرانى گوێ ى خەلك كەڕ دەكات!!!، وە بێگومان ڕيوايەتى تر هەن بەلاَم لێرەدا بەوەندە كۆتاى پێ دێنين بەلاَم لەگەلێ ئەوەشدا دەبێت ئەوەمان لە بير نەچێت ئەم جۆرە گۆرانيانەش وەكوو زانايان فەرموويانە دەبێت كۆ مەلێ مەرجى تێدا بێت لەوانە:

١. نابێت ئەو گۆرانيە هيچ شتێكى تێدا بێت كە پێچەوانەى شەرعى خوابێت

جل جلاله _ وەووشەو پيا هەلدانى ناشيرينى تيادا نەبێت وەكوو پيا هەلدان بەسەر ئافرەت و عەرەق و ئەو شتانەى كە قەدەغەكراوون .

٢. نابێت هيچ جۆرە ئامێرێكى مۆسيقاى لە گەلێ بێت چونكە ئەگەر ئامێرەكانى مۆسيقاى لەگەلێ بوو وەكوو عود و كەمان و تەپلێ و پيانۆ و .....هتد باگۆرانيەكەش شەرعى بێت هەر حەرامە و ڕێگە پێدراو نى

یە جگە لە دەف ئەویش پیاو بەکاری ناهێنێت بەڵکو کچۆڵە بەکاری دەهێنێت  لە زەماوەندوو جەژنەکاندا والله اعلم .

٣. نابێت بەردەوام بێت لەسەری و ئالوودەی بێت و بیکاتە پیشەو میهنە چونکە پارە وەرگرتن لەسەری مرۆڤ لادەدات لە اصلی خۆی وە بەلای هەندێ لەزانایان کە کەسێ زۆر بیکاتە پیشەو بەکاری بهێنێت شاهیدی لێوەر ناگیرێ هەروەکوو إبن تیمیە ڕەحمەتی خوای لێبێت دەفەرمووێ:﴿ ولكن نصب مغنية لنساء والرجال منكر بكل حال بخلاف ماليست صنعتها وكذلك أخذ العوض عليه ، والله اعلم﴾

واتە : دانانی گۆرانی بێژ بۆ ئافرەتان و پیاوان ئەمە بەهەموو شێوەیەك مونكەرە بە خیلاف و پێچەوانەی ئەو كەسەی نەیكردۆتە پیشە ، وەهەروەها كرێ لەسەر وەرگرتنیشی مونكەرە والله اعلم .

لێرەوە ڕووم دەكەمە مووسڵمانان و دەڵێم شتێ هەیە زۆر سەرسامی كردووم ئایا ئێوەش وان ؟!! هەندێ لەزانایانی ئەمڕۆ ئەوانەی كە بە زانا لەناو خەڵكدا ناسراون ئەگەر پرسیاریان لێبكرێت و بڵێ ی زانایان ئەو قورئانەی كە لە تەعزیە كاندا دەخوێنرێت بەپارەیەكی زۆر یەكسەر نایەڵێ قسەكەت تەواو بكەیت دەڵێ حەرامە  تەشبیە نەبێت ئەگەر بڵێیت مامۆستایان ئەی ئەو گۆرانیانەی كە لێدەدرێ و پارەی پێپەیدا دەكرێ و پارەی لێوەردەگیرێ حوكمی چۆنە ئەگەر خوا ڕەحمت پێبكات جوابت بداتەوە دەڵێ وە الله بڵێم چی إنشاء الله گرفتی تێدا نابینم !!!!

٤. نابێت ئەو گۆرانیە سەرقاڵی بكات لە واجبە شەرعیەكان و واجبەكان  بفەوتێنی یان بە قوربانی فەوتانی بكات چونكە هەرشتێ ببێتە مایەی فەوتانی واجب حەرام دەبێت ئەگەر ئەو شتە بەتایبەتی لە بابی گۆرانی و ....هتد بێ والله اعلم .

## ﴿مقامات یان سەر لێشێواندنی مووسڵمانان ﴾

زەنگێکی ترسناك ڕووی کردۆتە مووسڵمانان کە نزیکە هەموو شوێنێك بگرێتەوە و مووسڵمانان فریوی بخۆن کە ئەویش دزە کردنی ئاوازی مۆسیقایە بۆ خوێندنی قورئانی پیرۆز پەنا بەخوا ، دەبینین لێرەو لەوێ کاتێ پێشبڕکێی قورئانی پیرۆز دەکرێت چەند مامۆستایەك دادەنێن بۆ تاقی کردنەوەی ئەو قوتابیە قورئان خوێنە ، وەیەك لەو مامۆستا یانەی کە دای دەنێن پێ ی دەڵێن تایبەت بە مەقامات کاتێ کە قوتابیەکە قورئان دەخوێنێ دەڵێ لەسەر مەقامی رست یان حجاز یان صبا یان سیکا یان بیات یان نهاوند یان عجم یان کردی یان زنجران ...هتد دەخوێنێ !!!!! تەنانەت بەوەشەوە نەوەستاوە بەڵکو بانگیشیان هێناوەتە پاڵ و دەڵێن ئەو بانگە لەسەر مەقامی رست یان حیجاز یان ......هتد !!!! بۆیە منیش بە پێویستم زانی کە حوکمی مەقامات ڕوون بکەمەوە بە ئومێدی ئەوەی مووسڵمانان فریو نەخۆن و لێ ی بە ئاگا بن ، بێگومان ئەم بابەتەش خاڵی نیە لە نیزاع و بەربەرەکانێ وە لەگەڵ ئەوەشدا شاراوە نیە کەچەند قەول و قسە هەیە لەسەری هەندێ دەڵێن ڕێگە پێدراوە وەهەندێ دەڵێن مەکروهە وە هەندێ دەڵێن حەرامە بەڵام مووسڵمانی ژیر دەبێت بزانێت ﴿العبرة بالحق ودلیله لا بقول وقائله﴾ بۆیە بە ووتی وووتیان نابێ بەڵکو بەدەلیل و بەڵگە دەسەلمێنرێ کە حەڵاڵە یان حەرامە یان مەکروهە وە بە پشتیوانی خوای تعالی جل وعلا هەوڵ دەدەم کە قەولی راجح پەسەند بەیان بکەم إنشاءالله ،

بێگومان کە دەڵێین جائز نیە لەبەر چەند هۆیەکە کە زانایان باسیان فەرمووە :

أ ~ أن ذلك ليس من هدي النبي ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ والسلف الصالح رضى الله عنهم

واته:﴿ له ڕێنمونی و هەدی پێغەمبەر نیه ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ وه له هەدی سەلەفی صالحیش نیه کەواته پێویستمان بە دەلیل و بەلگە هەیە لەسەر ڕەوا بوونی وه ئیلا أصل تیایدا ڕێگریە چونکه أصل لە عیبادەتدا مەنعه هەتا بەلگەی لەسەر دەهێنی وه لێرەشدا بەلگە نیە کەواتە ڕێگە پێدراو نیه

ب~ بەلایەنی کەمەکەی ئەم مەقاماتانە کەباس دەکرێت شوبهەی تێدایه دەی بۆ ئینسا نی مووسڵمان خۆی بخاته شوبهه یه کەسەڕی لە حەڕام دەردەچێت وەکو دەفەرموویت :﴿فمن حام حول الحمى أوشك ان يرتع فيه﴾ کەواتە گەڕان بە دەوری حەڕامدا کەوتنه ناویەتی خوای تعالی جل جلاله ئێمەش و ئێوەشی لێبپارێزێ .

ج~ قەدرو ڕێزی قورئانی پیرۆز وه گەورەی و پلەو پایەی لەلامان لە دینەکەماندا بێ وێنەیە دەی ئەگەر واز لە مەقامات بێنین ئەوە پاراستنە لە تێکەڵ بوون لە ئاوازو ئەلحانەکانی ئەهلی دەرچوو ئالودەکان بە مۆسیقا !!! بێگومان ئاوازێ بۆ مۆسیقا دابنرێ چۆن بۆ قورئانی پیرۆز ئەبێ ؟!!! چۆن ئاوازی مۆسیقا لەگەڵ ئاوازی قورئانی پیرۆز کۆ دەبێتەوە بەڕاستی نامۆو سەرسوڕهێنەرە ؟!!!

د~ ئەگەر ئەم مەقامات و ئاوازانە قازانج و سوودی تیادا بێت ئەوا بێگومان مەفاسیدو تێکدانی زۆر لەوە زیاترە وەواز هێنانی مەفاسید باشترە لە هێنان و ڕاکێشانی قازانج و سوود چونکە ڕۆژ بەڕۆژخراپەکانی مەفسەدەو تێکدانەکانی زیاد دەکات ئێستا وای لێهاتووە خەڵکانێ دەچن خۆیان فێری مەقاماتی مۆسیقی و ئاوازەکانی دەکەن تاوەکو دوایی بتوانێ بە خوێندنێکی نامۆ و خۆش قوڕئان

بخوێنێ !!!! بەڵکو هەندێ گوێ لە گۆرانی و مۆسیقا دەگرن و لەزەتی لێدەبینن بەناوی ئەوەی کە ئەیانەوێت و پێویستیانە بۆ خوێندنی قورئانی پیرۆز !!!! وەئەمە لەزۆرێ لەو وولاتە عەرەبیەکاندا باوەو ئینکاری لێناکرێ وە لەسەرو ئەمانەشەوە ڕۆشنە کە بیدعەیەکی مەزمومە

هـ- ڕازاندنەوەی دەنگ واتە ﴿ تزين الصوت﴾ موستەحەبە واجب نیە واتە لەکاتی قورئان خوێندندا دەی ئێمە بۆ بۆ موستەحەبێ خۆمان بخەینە حەرام یان کەمترینی مەکروهو شوبهە ؟!!!!

پاشان بابچینە خزمەتی زانایان بابزانین چۆن باسی دەکەن :

سەرەتا قەولی ابن القيم باس دەکەین ڕەحمەتی خوالی لێبێت کە دەیکات بە دوو بەشەوە کە پوختەکەی ئەمەیە :

١- ئەوەی کە ئەو قورئان خوێنە دەیخوێنێ بەسروشتی خۆی بەبێ ئەوەی خۆی فێری مەقامات بکات واتە لەسەر ئاوازی مۆسیقا ئەوەی بە سروشتی خۆی وایە ئەوە شتێکی ڕەواو جائزە واتە بەسروشتی خۆی قورئان بە دەنگێکی خۆش بیخوێنێت و هەوڵبدات خۆشتر بیخوێنێ ئەمەڕێگە پێدراوە و جائزە وەکوو ابو موسی ی ئەشعەری ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێت کە بە پێغەمبەری خوای ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ فەرموو ﴿لَوْ عَلِمْتُ أَنَّكَ تَسْمَع لَحَبَرْتُه لَكَ تَحبِيراً ﴾ دەی بێگومان نەفسی مرۆڤ ئەمە قبوڵ دەکات چونکە گونجاوە لەگەڵ نەفسدا کە کەسێ بەسروشتی خۆی بیخوێنێ ، وەبێگومان سەلەفی صالحیش وایان خوێندوە گوێشیان لێگرتوە

٢- ئەوەیان کەدروست کراوە لەسروشتی مرۆڤ نیە بەڵکو نەك لەسروشتی مرۆڤ نیە بەڵکو دەبێ فێری بێت وهەوڵی بۆبدات و لەسەری ڕاهێنان بکات وەکوو چۆن فێری ئاوازو لەحنی گۆرانی ئەبێت

واته وەكو ئێستا چۆن ڕاهێنان ئەكەن لە پەیمانگا مۆسیقیەكان !!وە ئەوەی شارەزا بێت بە ئەحوالی سەلەفی صالح دەزانێت كە سەلەفی صالح زەمیان كردووە و مەنعیان كردوە وە ابن قیم ڕەحمەتی خوای لێبێت دەفەرمووێ هەرچی زانستی هەبێت بە ئەحوالی سەلەفی صالح دەزانێ كەسەلەفی صالح بەریە لەو مەقامات و ئاوازانەی كەدروست كراوو ئاواز بۆ دانراون وە دەفەرمووێ سەلەف ڕەحمەتی خوایان لێبێت بە دەنگی خۆش قورئانیان خوێندووە و هەوڵی جوان خوێندنەوەیان داوە بەسروشتی خۆیان هەندێ جار بە دڵ تەنگی خوێندویانە وە هەندێ جار بەشەوق و خۆشی زۆرەوە واتە لەو ئایەتانەی كە مژدەی خۆشیان تیایە والله أعلم كە ئەمە جائیزە و ڕەواو چاكە هەروەكوو پێغەمبەر ﴿ صلى الله عليه وسلم﴾ دەفەرمووێ ﴿ لَيْس مِنَّا مَنْ لَمْ يَتَغَنَّ بِالقُرآن﴾ كە بەپشتیوانی خوای پەروەردگار ڕاڤەی ئەو فەرموودە دەكەین .

پاشانیش زانایان بۆچونیان لەسەر مەقامات بەم جۆرەیە :

أمامی مالك ڕەحمەتی خوای لێبێت دەفەرمووێ:

﴿ ولا تعجبني القراة بالالحان ، ولا احبها في رمضان ولا في غيره ، لانه يشبه الغناء﴾[102]

واتە:﴿ سەرسامم ناكات خوێندنی قورئان بەئاواز واتە ئەو مەقاماتانەی كە دەبینن وەدەفەرمووێ خۆشم لێی نایە نە لە ڕەمەزان و نە لە غەیری ڕەمەزان لەبەر ئەوەی لە گۆرانی ئەچێت﴾

وە عبدالله كوڕی ئیمامی ئەحمەد دەفەرمووێ :

﴿ سمعت أبي وقد سئل عن القرأة بالحان ؟ فقال محدث﴾[103]

---

102 _﴿الحوادث والبدع للامام الطرطوشی _ تحقيق علي الحلبي _ صفحة ٨٣.

واتـه :﴿ گـوێم لێبـوو پرسـیاریان لـه بـاوكم كـرد سـەبارەت بـه ئاوازلـه قورئان خوێندندا ؟ فەرمووی داهێنراوه .

وەیەعقوبی هاشمی دەفەرموێ :﴿ سمعت ابي انه سأل أبا عبد الله عن قراءة بالالحان ، فقال هو بدعة ومحدث قلت تكرهه يا أبا عبد الله ~ أي الامام أحمد ؟ قال نعم أكرهه إلا ماكان من طبع كما أبو موسى...﴾[١٠٤]

واتـه : ﴿ گـوێم لێبـوو بـاوكم پرسـیاری كـرد لـه امـام أحمـد لـەبارەی خوێندنی قورئـان بـەئاواز فـەرمووی ئـەوه داهێنـراوه ودروسـت كـراوه ووتم ڕقت لێیه ئەی أبا عبدالله ؟ فەرمووی بـەڵێ ڕقـم لێیـه ئـیلا ئـەوه نەبێت كه له سروشتی مرۆڤ خۆیدایه وەكوو خوێندنی ابو موسی...﴾

وەهەروەها لەڕیوایەتێكی تردا دەفەرمووێ:﴿عن عبدالرحمن المتطبب يقول :﴿ قلت لأبي عبدالله في القراءة الالحان ؟ فقال ﴿ ياأبا الفضل اتخذه أغاني ، اتخذه أغاني لاتسمع من هؤلاء﴾[١٠٥]

واتـه:﴿ پرسـیارم كـرد لـه ئیمـامی احمـد لـەبارەی خوێنـدنی قورئـانی پیرۆز بەئاواز واته وەكو ئیمڕۆ نـاوی دەبـەن بـه مـەقامات ؟ فـەرمووی ئەی أبـا فـضل كردویانـه بـەگۆرانی ، كردویانـه بـه گـۆرانی ، گـوێ لـەو كەسانه مەگره ﴾

---

103 _﴿الحوادث والبدع للامام الطرطوشي _ تحقيق علي الحلبي صفحة ٨٤ ، وفي ﴿ المقصد الارشد في ذكر اصحاب الامام أحمد ج١ ص ١٦٤.

104 _﴿ رواه الخلال في الامر بالمعروف والنهي عن المنكر﴾ و ﴿ المقصد الارشد في ذكر اصحاب الامام احمد ج١ص١٦٤.

105 _﴿ رواه الخلال في الامر بالمعروف والنهي عن المنكر﴾ و﴿المقصد الارشد في ذكر أصحاب الامام أحمد ج٢~ص ٨٠.

وەلەبارەی ئیمامی شافعیش ڕەحمەتی خوای لێبێت :دەفەرمووێ:

﴿ روي الربيع بن سليمان الجيزى عن الشافعى انه كره القراءة بالالحان﴾[١٠٦]

واتە: ﴿ بەلایەوە ناپەسەندبووەو ڕقی لێبوە ﴾

وە محمدی کوڕی هە یثە م دەفەرمووێ :

﴿ لأن أسمع الغناء أحب الي من أن أسمع قرأءة الالحان ﴾ رواه الخلال في الامر بالمعروف والنهي عن المنكر .

واتە:﴿ ئەگەر گوێ لە گۆرانی بگرم پێم باشترە لە گوێ گرتن لە خوێندنی بەئاواز﴾ وە شێخ أبوبكر ئەبو زەید لە کتێبی بدع القراء دەفەرمووێ :﴿ التلحين في القراة تلحين الغناء والشعر ، وهو مسقط للعدالة ، ومن أسباب رد الشهادة قضاء ، وكان أول حدوث هذه البدعة في القرن الرابع على أيدي الموالي ﴾

واتە:﴿ ئاواز لە خوێندنی قورئانی پیرۆز دا ئاوازە لە گۆرانی و شیعریشدا کە دەبێتە هۆی لە دەست دانی دادپەروەری وەدەبێتە هۆی وەرنەگیرانی شاهیدی وەیەکەم ڕووداو و بیدعە بوو لە سەدەی چوارەم بوو لەسەر دەستی مەوالیەکان بوو . وەهەر لەهەمان کتێب دەفەرموێت :﴿ هذا يدل على انه محذور كبير وهو قراءة القران بالألحان التي يسلك فيها مذاهب الغناء وقد نص الائمة رحمهم الله على النهي فيه﴾

وە شیخ الاسلام ابن تیمیە ڕەحمەتی خوای لێبێت دەفەرمووێت : ﴿ قرأءة القران بصفة التلحين الذي يشبه تلحين الغناء مكروه مبتدع كما نص على ذلك مالك والشافعي واحمد وغيرهم من الائمة﴾[١٠٧]

---

106 _﴿الحوادث والبدع للامام الطرطوشى ~ تحقيق علي الحلبي ~ص~٩٠.

واته:﴿ خوێندنی قورئانی پیرۆز بەشێوەی ئاواز و لەحن کە لە ئاوازو لەحنی گۆرانی دەچێت ناپەسەند و داهێنراوە هەروەکو ئەوەی کە بەلای ئیمامی مالیك وئیمامی شافعی و ئەحمەد و غەیری ئەوانیش وایە﴾

وەهەروەها ئیمامی الدارمی لە سوننەکەیدا بابێکی ناو ناوە بە ﴿باب كراهة الالحان في القران ﴾ وەئەم ڕیوایەتانەی هێناوە

﴿ أخبرنا عبدالله بن سعيد عن عبدالله بن أدريس عن الاعمش قال :﴿ قرا رجل عند انس يلحن هذه الالحان فكره ذالك انس﴾ ٣٥٠٢

واته:﴿ پیاوێ لای ئەنس قورئانی ئەخوێند بە شێوازی ئاوازو لەحن ئەنەس پێی ناخۆش بوو ئەو ئاوازە واتە ئاوازێ کەلەسەر شێوازی مۆسیقا بێت کە ئێستا ناوی دەبەن بە مەقامات﴾

وەلە ڕیواتێکی تردا:﴿ حدثنا العباس بن سفيان عن بن علية عن عون عن محمد قال:﴿ هذه الالحان في القرآن محدثة﴾[108]

واته:﴿ ئەو ئاوازانە لە قورئان خوێندندا پەیدا بووە دروست کراوەو پەیدا بووە ﴾

وە إبن شيبه ڕەحمەتی خوای لێبێت دەفەرمووێ :﴿ أخبرنا عمران بن عبدالله بن طلحة ﴿ أن رجلا قرأ في المسجد النبي ~صلى الله عليه وسلم~ في رمضان فطرب فأنكر ذالك القاسم وقال يقول الله تعالى ﴿ وانه لكتاب عزيز لاياتيه الباطل من بين يديه ولا من خلفه تنزيل من حكيم حميد ﴾[109]

---

107 _﴿المستدك في المجموع الفتاوى ج٣~ص ١٠٥

108 _﴿ سنن الدارمي ~باب كراهة الالحان في القرآن﴾.

109 _﴿التطريب من كرهه ﴾ لابن شيبة الاية ٤١~٤٢~سورة فصلت .

واته:﴿ پیاوێك له مزگەوتی پێغەمبەر ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ لەڕەمەزاندا بەجۆری گۆرانی بێژان ئەی خوێند قاسم ئینکاری کردوو فەرمووی خوای پەروەردگار دەفەرمووێ .. ئایەتەکەی بۆ خوێندەوە ﴾

وەابن نعیم ڕەحمەتی خوای لێبێت دەفەرمووێ :﴿ حدثنا اسحاق بن أحمد بن علي ثنا ابراهيم بن يوسف بن خالد ثنا أحمد ابن أبي الحواري قال سمعت أبا داود الطرطوسي يقول قلت لعبدالله بن مبارك ﴿ إنا نقرأ بهذه الالحان فقال إنما كره لكم منها انا أدركنا القراء وهم يؤتون تسمع قرأتهم وانتم تدعون اليوم كما يدعي المغنون﴾ [110]

وەفەتوای زانایانی سەردەمیش زۆرن لەوانە:

شێخی عەلامە و پایەبەرز عبد العزيز بن عبدالله بن باز ڕەحمەتی خوای لێبێت دەفەرمووێ ﴿ لايجوز للمؤمن ان يقرأ القرآن بألحان الغناء وطريقة المغنين بل يجب أن يقرأ كما قرأه سلفنا الصالح من أصحاب الرسول ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ وأتباعهم باحسان فيقرأ مرتلا متحزنا متخشعا حتى يؤثر في القلوب التي تسمعه وهو ذالك ، أما ان يقرأ ه على صفة المغنين وعلى طريقتهم فهذا لايجوز﴾ [111]

واتە:﴿ ڕەوانیە بۆ ئیماندار کە قورئانی پیرۆز بخوێنێ بە ئاوازو لەحنی گۆرانی وەرێگەی گۆرانی بێژان بەڵکو پێویستە بخوێنێ وەکو سەلەفی صالح و هاوەڵانی پێغەمبەر ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ وە شوێن کەوتوانیان کە بە جۆرێك دەیان خوێند کە بە لەسەرخۆیی و دڵتەنگی

---

110 _﴿ حلية الاولياء ج~٨~ص~١٦٩.

111 _﴿ كتاب مجموع فتاوى ومقالات متنوعة لسماحة الشيخ العلامة عبد العزيز بن عبدالله بن باز رحمه الله م~٩~ص~٢٩٠.

وملی کەچی دەیان خوێنند تاوەکو کاریگەری بکاتە سەر دلآن دلآنیٚ کە گوێبیستی بوون ، بەلآم ئەوە ی کە لەسەر سیفەتی گۆرانی بێژان و ڕێگەی ئەوان دەخوێنێ ڕەوا نیەو ڕێگە پێدراو نیە﴾

وەزۆرێ لە زانایانی تر ، وە لە زانایانی سەردەمیش لەوانەی کە بەلایانەوە جائز نیە : شێخی پایەبەرز دکتور عبد الله جبرین ڕەحمەتی خوای لێبێت ، وە شێخ أبن باز ، وەشێخ ابن عثیمین ، والفوزان ، وآل شیخ ، وەزۆرێ لە زانایانی تر،

وەپاشان بە هەڵە تێگەیشتنی چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﴿صلى الله عليه وسلم﴾ وای کردوە کە مووسڵمانان بەرەو ئەو هەڵە گەورەیە بەرێ پەنا بە خوای گەورە ، چونکە بێگومان فەرموودەی پێغەمبەریش ﴿صلى الله عليه وسلم﴾ پێویستی بەتێگەیشتنە وەدەبێ بزانین کە هاوەڵآن چۆن ڕاڤەیان کردووە ولێ ی تێگەیشتون یان سەلەفی صالح وزانایان چۆن ڕاڤەی دەکەن ،

بۆ نموونە ئەوانەی کەدەڵێن مەقامات لە خوێندنی قورئانی پیرۆزدا درووستە ، چەند فەرموودەیەك دەکەنە بەلگە کە بێگومان ئەو فەرموودانە هیچ بەلگەی ڕەوابوونی تێدانیە

لەوانە: ئەو فەرموودەیەی کە أبو هريره ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێت کە دەفەرمووێ پێغەمبەر ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ فەرمووی ﴿لَيْس مِنَّا مَنْ لَمْ يَتَغَنَّ بِالقرآن ﴾ [112]

بێگومان زانایان ڕۆشنیان کردۆتەوە کە ئەم فەرموودەیە بەلگە نیە لەسەر بەڕەوا بوونی مەقامات وەمانای ﴿يتغن﴾ واتەی ﴿أن يحسن القارىء صوته بالقرآن ويجهر به﴾ وە ئیمامی شافعیش دەفەرمووێ

---

112 _﴿ رواه بخاري ومسلم ﴾

﴿ يتغن﴾ واتەی ﴿يرفع صوته به﴾ واته دەنگی بەرز دەكاتەوە وە لە ليث دەفەرمووێ ﴿يتحزن به ويتخشع به ، ويتباكى به ﴾
واتە: ﴿دەفەرمووێ بەدڵتەنگی و مل كەچی و بەگریان بیخوێنێ﴾
وە وەلیدی كوڕی موسلم دەفەرمووێ :﴿ يتغنى بالقرآن يعني يجهر به﴾
كەواتەئەگەر لەسروشتی خۆی لایدا پیتەكانی دەگۆڕێت بەلاَم بە داخەوە لەبەر خاتری ئەوەی كە ئاوازەكەی لەسەر ئاوازی مۆسیقا بێت ضمة ئەكات بە واو ، یان فەتحە ئەكات بە ألیف ، وە كەسرە ئەكات بە یاء ،دەی ئەمەش ڕۆشنە كە مانای قورئانی پیرۆز دەگۆڕێت بۆیە لەڕیوایەتێكدا پیاوێك پرسیاری لە ئیمام ئەحمەد كرد لەبارەی مەقامات وە لەحن ئیمامی ئەحمەد فەرمووی: ﴿مَاسمُكْ؟ قَال مُحَمَد قَالَ أيَسَرَك أنْ يُقَال لك مُوحامد؟ قَالَ لاَ فَقَالَ لاَ يَعْجِبْني أن يتَعَلَّمَ الرَّجل الالحان ....﴾
واتە: ﴿ پیاوێك پرسیاری كرد لە ئیمام ئەحمەد لەبارەی ئاوازو لەحن ئیمام ئەحمەد فەرمووی : ناوت چیە؟ كابرا ووتی محمد ئیمامی ئەحمەد فەرمووی پێت بڵێن موحامد ؟ واتە بە مەد كابرا ووتی نەخێر پاشان فەرمووی پێم باش نیە یان سەرسامم ناكات كە پیاو خۆی فێری مەقامات بكات...﴾
كەواتە دەبێ قاریء دەنگی خۆش بكات و بەدەنگی بەرزو ئاشكرا بیخوێنێ بەلاَم پێویستە خوێنەر هەوڵ بدات بەئەندازەی خۆی.چەند دەتوانێ دەنگی خۆش بكات وە ئەگەر خەڵكی لە دەور بوو بەدەنگی بەرز بیخوێنێ تاوەكو دەورو بەری چێژی لێوەرگرن و كاریگەریان تێبكات هەر لەبەر ئەوەیە كە پێغەمبەر ﴿ صلى الله عليه وسلم﴾ شەوێكیان بەلای أبو موسای ئەشعەری تێپەڕی كە قورئانی دەخوێند وە

ئەشعەریەکان خاوەنی دەنگێکی خۆش بوون ، جا پێغەمبەر ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ گوێی لێبوو فەرمووی : ﴿ لَقَدْ أُوتِي هَذَا مِزماراً مِنْ مَزَامِيرِ آل دَاود ﴾ پاشان کە ڕۆژ بۆوە ئەبو موسا هات پێغەمبەر ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ پێی فەرموو ئەویش فەرمووی ﴿ یارسول الله ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ لو عَلِمتُ انَّك تَسمع لَحَبرتة لكَ تَحبيراً ﴾[113]

جامەبەست بە ﴿ مزمار ﴾ ئیمامی نەوەوی دەفەرموێ ﴿ الصوت الحسن ﴾ واتە دەنگی خۆش نەك پەنا بەخوا بچینە پەیمانگای مۆسیقی!!!!

کەواتە کەس نالێت بەدەنگی خۆش نەخوێنرێ بەڵکو موستەحەبە بەلاّم ناشبێ لابدرێ لە سروشتی خۆی وە ناشبێ فەرموودەکان بەهەڵە ڕاڤە بکرێت وەکاتێ دەفەرمووێ لە براء بن عازب :﴿ ان النبي ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ قال :﴿ زينوا القران بأصواتكم﴾[114]

دەبێ بزانرێ چۆن ڕاڤە دەکرێ و ئەم فەرموودەیەش تێگەیشتنی خۆی دەوێت کەبێگومان قورئانی پیرۆز زۆر لەوە گەورەترە کە بە دەنگی ئینسان برازێتەوە بەڵکو دەنگی ئینسان بە قورئان دەڕازێتەوە وەکو شعبە دەفەرمووێت : ﴿ نهاني أيوب ان أحدث زينوا القرآن بأصواتكم ﴾واتە ئەمە لە بابی ﴿ قلب﴾ ە وەکو خطابي دەفەرمووێ: ﴿ معناه زينوا أصواتكم بالقرآن ﴾ واتە بیرازێننەوە دەنگتان بە قورئانی پیرۆز نەك قورئان بە دەنگ!!!!

واتە : لە مانەوە دەردەکەوێ کەمەبەست لەم فەرموودە پیرۆزانە ئەوەیە کەبە دەنگی خۆش بخوێنرێت و بیری لێبکرێتەوە بەلاّم تێپەڕ

113 _﴿بخاري ومسلم من حديث ابو هريرة﴾

114 _﴿ رواه احمد وأبوداود والنسائي وإبن ماجة والدارمي .

نەکات بۆ مەقاماتی دروست کراو و ئاواز و لەحنی گۆرانی پەنا بەخوا !!! وە جوان خوێندنی قورئانی پیرۆز پێشی هەموو شتێ دەبێ بەڕاست و دروستی بخوێنرێت وە چاودێری مخارج ودەرچونی پیتەکان بکات و سەلامەت بێت لەئاوازو لەحن وە پارێزگاری مەدەکان وە إدغام وإظهار و إخفاء و إقلاب و إمالة وتحقیق تسهیل و الابدال و.... هتد بکرێ لە تەجویددا وە دەبێت بە نەرم ونیانی و لەسەر خۆی بخوێنرێت وە بیر لێکردنەوە لە فەرمانەکان وە لە نەهیەکانی وەکاتێ بە ئایەتێکی مژدەو خۆشی تێدەپەڕی داوای بکەی وەکاتێ بە ئایەتێکی سزا تێدەپەڕی پەنا بە خوا بگرێ خوا پەنامان بدات چونکە پێغەمبەر ﴿ صلى‌الله عليه وسلم ﴾ وای دەخوێند هەروەکو حذیفە رضي الله عنه دەفەرمووێ:﴿صَلَيْتُ مَعَ النَبي ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ ذَات لَيْلَة فَأفْتَتَح البَقرة فقَراهَا ، ثمَّ النِّساء فقَراها ،ُثمَّ آل عِمران فقَراها ، يَقرأ مُترسلا ، إذا مَرَّ بِسُؤال سَأل ، وإذا مَرَّ بِتَعوذ تَعَوَّذ﴾ [115]

واتە: ﴿ نوێژم لەگەڵ پێغەمبەر ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ دەکرد شەوێکیان سەرەتا سورەتی البقرەی خوێند پاشان سورەتی النساء خوێند پاشان آل عمران ی خوێند بەنەرم و نیانی دەیخوێند کاتێ تێدەپەڕی بە ئایەتی داواکردن داوای دەکرد ، وەکاتێ تێدەپەڕی بە لای ئایەتی پەنا گرتن دا پەنای دەگرت ﴾

کەواتە دەبێ لەسەر ڕێنمونی ئەو بیخوێنین ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ نەك بەناوی مەقامی رست و حیجاز و سیکا ................هتد

وە بێگومان هەموو ئەو خوێنەرە بەناو بانگانەی کە قورئان دەخوێنن مەقامات و لەحن و ئاوازیان نەخوێندوە تەنها چەند کەسێکی کەمیان

---

115 _﴿ رواه مسلم ﴾

نـەبێت کـە بـە پەنجـەکانی دەسـت دەژمێـرێن !!! بـەڵام وەکـو شـێخ اسماعیـل دەفـەرمووێ کـاتێ قورئـانم دەخوێنـد دەیـان ووت ماشـاءالله مـەقامی رست !! حجـازە!! نهاونـدە!!! منـیش بێئاگـا بـووم لێـی !!!!!!!!! بەڵکو هەندێکیان دەڵێن جار هـەبووە ئایـەتی عـەزابم ئەخوێنـد ئـەیان ووت الله یاشێخ رست !!! حجاز!!! إنا لله وإنا اليه راجعون ﴾.

## ﴿ چەند ووشەیەك لەسەر سروودە ئیسلامیەکان ﴾

بەپشتیوانی خوای تعالی جل جلاله ئەمە دەکەمە کۆتای ئەم کتێبە بە ئومێدی ئـەوەی کە کتێبێکـی بەسوود بێت و مووسڵمانان بەگشتی سوودی لێ ببینن و ببێتە مایەی ڕەواندنەوەو نـەمانی دوو دڵـی لـە دڵـی مووسـڵمانانـدا و ئەسـباب و هۆکـارێ بـێ بـۆ ڕزگـار بوونمـان لـە نارەحەتیـەکانی دوا ڕۆژ، ئێـستا ئـەوەی کـە زیـاتر بـڵاوە تەنانـەت تەلەفزیۆنـە ئیـسلامیەکان و ڕادیـۆ کـان و تۆمارگاکـان بـڵاو کردنـەوەو لێدانی سرودی ئیسلامیەکان بە جۆرێکی وا کە ئەوەندە گوێی خەڵکیان پێ ئاو داوە کە چۆتە بـابی ئـەوەی کـە پێغەمبـەر ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ چۆن شەکوای خۆی گەیاندە خوای رب العالمين لـە قەومەکـەی ﴿ وَقَالَ الرَّسولُ يَارَبِّ إنَّ قَوْمِي اتخَذُوا هَذاَ الْقُرْآنَ مَهْجُوراً﴾ [116]

جا لەم ڕۆی ئێمەدا پـەنا بـەخوا ئـەم ئایەتـە پیرۆزە زۆر ترسناکە کە کەم کەس بیری لێبکاتەوە و ترسـی لێـی هـەبێت کـە هـەجر لـە قورئـان چۆنە پەنا بەخوا ئەواتا هەنـدێ لەوانـەی خـۆ بـە زانـا دائـەنێن دەڵێن گۆرانی و مۆسـیقا زۆر جار زانـستی پزیـشکی بـۆ چارەسـەری نەخۆشـی داناوە و دەشێ بۆ چارەسەر بەکار بێت !!!

116 _﴿الفرقان﴾ الاية ٣٠

مــن لێــرەدا فەرموودەیــەکی ئــیبن القــیم لــە ڕاڤــەی ئــەم ئایەتــەدا ئەخەمەوە بیر کە دەفەرمووێ :﴿ وهجر القرآن أنواع: أحدها: هجر سماعه والايمان به والاصغاء اليه والثاني : هجر العمل به والوقوف عند حلاله وحرامه وإن قرأه وآمن به والثالث: هجر تحكيمه والتحاكم إليه في اصول الدين وفروعه وإعتقاد أنه لا يفيد اليقين والرابع: هجر تدبره وتفهمه ومعرفة ماأراد المتكلم به منه والخامس هجر الاستشفاء والتداوي به في جميع أمراض القلوب وأدوائها ﴾[١١٧]

ئەگەر ڕابمێنین لەم شیکردنەوەیەی ابن القیم ڕەحمەتی خوای لێبێت دەبینین دەڵێ ی بۆ ئەم ڕۆژگارەی ئێمەی فەرمووە ئەوەتا یەکەمیان دەفەرمووێ دوورکەوتنەوە لە گوێ گرتن لێی کام لەئێمە ڕۆژانە مۆسیقاو گۆرانی زیاتر نابیستێ لە قورئان ! تەنانەت کە جێگەی داخە لە تەلەفزیۆنە ئیسلامیەکانیش ئەوەندەی گۆرانی ومۆسیقا بۆ خەڵك لێدەدەن چارەکێکی ئەوە ناتوانن سوود بەموسڵمانان بگەیەنن هەتا وای لێهاتووە تەنانەت ئەگەر ووتارێکی ئاینی لێبدات یەکسەر بە دوایدا هەر کە تەواو بوو دەبێتە دەهۆڵ و زووڕنا !! یان کەدەفەرمووێ دوورکەوتنەوە لە ئیش پێکردنی و وەستان لەسەر حەڵاڵ و حەڕامی بابیشی خوێنێ و ئیمانیشی پێ ی هەبێت !! ئەوەتا بەڵگەی ئایەتی قورئانی پیرۆزو فەرموودەی صەحیحی پێغەمبەری ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ بۆ دێنی لەسەر حەڕامی مۆسیقاو گۆرانی دەڵێی نە بای دیوەو نەبۆران !!! والله مستعان یان کاتێ دەفەرمووێ دوور کەوتنەوە لە حوکم پێکردنی و کردنی بە حاکم لە أصل و فەرعیدا ئەوەتا تەئویل بۆ

---

117 _﴿الفوائد﴾ ابن القيم

حەرامەکانی دەهێننـەوە جا چ بگات بـە حوکم !!! یـان کەدەفـەرمووێ دوورکەوتنـەوە لـە بـیر لێکردنـەوەو تێگەیـشتنی ! مـن لێـرەوە دەڵـێم ئەگـەر مووسـڵمانانی ئـەمرۆ ئـەو لێ وردبوونـەوە وبیرکردنـەوەو تێگەیشتنەیان بوایـە لـە قورئـان چۆن بـە عـود و کـەمان و پیـانۆ و... گوێی مووسڵمانانیان کەڕ ئەکرد !!!وەکۆتای فەرموودەکەی ئیبن القیم ڕەحمـەتی خـوای لێبێـت کـە دەفـەرمووێ دوور کەوتنـەوە لـە شـیفای قورئانی کە چارە سەری هـەموو نەخۆشیەکانە کـە بێگومـان بـۆ دڵ و ڕۆح و لاشە وێنەی نیەو وێنەی نابێ بەلام مـن لێـرەوە بـە ئیبن القیم دەڵێم مووسڵمانان بڵێن چی کە کۆمەڵێ بـەناو زانـا شیفا لـە مۆسیقاو گۆرانی دەبینن !!!!

بۆیە تۆی مووسڵمان کاتێ دەڵێی نەشید یان سروودی ئیسلامی دەبێت مووسڵمانانە بێت بەلام بەداخەوە ئێستاو لە ڕۆژگـاری ئێمـەدا سروودی ئیسلامی نەماوە یـان زۆر کەمـە بـەڵکو ئـەوە فێڵێکەو شـەیتان خـەڵکی پێخەڵەتاندووە ئـەوەتا هـەموو سرودێك کەپـەخش دەکرێـت بـە عـودو کـەمان و ئامێرەکـانی مۆسـیقاوە پیـشان خـەڵك ئـەدرێت بـە پاسـاوی ئەوەی کە دەڵێن ئاخر هەموو خـەڵکی لـە تـەواوی دونیـا بـەکاری دێـنێ ئێمەش نابێ ووشك بین !!! یان زۆرینەم بۆ ئەکاتە بەڵگە !!

دەڵـێین بـەو کەسـانەی کەئـەو جـۆرە پاسـاوانە دەهێننـەوە دەلیـل و بەڵگـەی قورئـان و سـوننە هەیـە لەسـەر حـەرامی ئـەوە بـەس نیـە !!!! وەئەگـەر بـەوەش دڵ ئـارام نابێـت دەڵـێم باشـە زۆرینـە ئەگـەر بکەیتـە پاسـاو لـە گـەرمای هاوینـدا سـێ بەشـی زەوی خـۆرە سـێ بەشـی زەوی دەبێتـە گەرماو هـەتاو لێمـان تـۆ بـۆ ئەچیتە بـەر سێبەرو خـۆت لـەو هەموو بەر خۆرە دەپارێزی خۆ زۆری زەوی دەبێتە خۆرو گەرمی ئـەی بـۆ لـەوەدا خـۆت دەپارێزی و دەچیتە بـەر سێبەر بـۆ نـاتوانی خـۆت

بپارێزی له دههۆڵو زوڕنا كه خهڵك بهكاری دێنێ؟!!!!!﴿ قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا لَّوْ كَانُواْ يَفْقَهُونَ﴾ [118]

پاشان فێڵهكانی شهیتانه وورده وورده له نهشیدهكانهوه ئهگهر وریا نهبیت دهتباته سهر ڕاڕهوێ كهوورده وورده دڵتان ڕهق دهبێت و گوێ بیستی مۆسیقاو گۆرانی و ئامێرهكانیش لهلاتان ئاسایی دهبێت لێرهدا مهبهستم سروودو نهشیدی ئیسلامی پاك وبێگهرد نیه كهبهبێ ئامێر دهوترێ بهڵكو ئهوهی كهئێمه ئهمڕۆ له وولآتی خۆماندا دهیبینین هیچی به بێ ئامێر نیه بۆیه زۆرێ له خهڵكی لایان داوه ، پاشان لهدوای ئهوهی كه بۆمان ڕۆشن بۆوه كه دروست نین ئامێرهكان بهكار بهێنرێ شێخ البانی ڕهحمهتی خوای لێبێت شتێكی زۆر جوان دههێنێ كه ببێته نمونه بۆ مووسڵمانان كهنهكهونه داوو پیلان و فێڵی شهیتان دهفهرمووێ:

﴿ باشم له بیره من كاتێ له دیمهشق بووم پێش ئهوهی بچمه عمان به دووساڵ ههندێ گهنجی مووسڵمان دهستیان دایه ههندێ گۆرانی و نهشیدی ساف و پاك و بێگهرد و ڕهوا ماناكانیان شهرعی بوون و بێ كێشه بوون ، بههۆی ئهوهوه دژایهتی صۆفیهكانیان پێ ئهكرد وهكو البوصیری و غهیری ئهویش ئهمانهیان خسته سهر شریت پاشان شێخ البانی ڕهحمهتی خوای لێبێت دهفهرمووێ: ئهوهندهی پێنهچوو دهفیشیان هێنایه ئاراوه بهكاریان هێنا !! یهكهم جار دهفیان بهكار هێنا له ئاههنگی زهماوهندا بهبهڵگهی ئهوهی ڕهوایه بهڵام شریتهكهی بڵاو بۆوه و چهند نوسخهیهكیان لێ گرتهوه و پاشان بڵاو بۆوهو لهزۆرێ له ماڵی مووسڵماناندا لێیان دهدا بهبێ بۆنهو مناسهبه بهشهو ڕۆژ!!!!

---

118 ـ﴿التوبة﴾ الاية ٨١

بۆیە خوێنەری بەڕێز وە بەتایبەت مووسڵمانانی بەڕێز دوورکەونەوە لە مۆسیقاو ئامێرەکان وە سروشتی پاکی خۆتانی پێمەشێوێنن ، ئەوانەیشی کەتا ئێستا گوێبیستی بوون و بەشوبهە و هەڵەی خەڵکی تێکەوتون ئومێدەوارم تەوبە بکەن لێیی و وازی لێبێنن اللهم هل بلغت اللهم فأشهد

جانەم نووسراوەم وەلامی هیچ کەسێك نی یە کەمن لەسەنگەری دژایەتی بم بەڵکو وەلامی ڕاو بۆچونی هەڵەی زانایانە بە زانایان نەك بەندە ، وەئەوەی کەسەرنج و تێبینی هەبوو لەسەر ئەم نووسراوەم من دوعای بەخێری بۆ دەکەم وە ئەمە هەوڵ و کۆششی زانایانە نەك بەندە پاشان ئەگەر هەڵەو کەم و کورتی تیا بەدی کرا داوا لە خوای پەرودردگار دەکەم لێم خۆش بێت وە ئێوەش دوعای بەخێرم بۆ بکەن خوای تعالی جل جلالە وای لێکردبم کەنووسینەکەم لەبەر ڕەزامەندی خوای تعالی بوبێت و پێنووسم لەسەر کاغەز دانەنابێت تەنها مەبەستم ڕەزامەندی خوای تعالی بوبێت وەهەر چەندە دڵنیام لەوەی کە منیش گوناە و تاوانەکانم بۆتە ڕێگر لە صەواب بەلاَم کاتێ لەبەر ڕەزامەندی خوای تعالی بتەوێ شت بنووسی یان کارێکی خەیر ئەنجام بدەیت ڕەحم و بەرەکاتی خوای تعالی جل جلالە لەگەڵت دەبێت بۆیە منیش واجبە لەسەرم بیرم نەچێت و بنووسم :

سوپاس و ستایشت دەکەم خوای تعالی لەسەر هەموو نیعمەتەکانت کەپێت داوم سوپاس و ستایشت دەکەم خوای تعالی لەسەر شارەزاکردنم سوپاس و ستایشت دەکەم خوای تعالی لەسەر یارمەتی دانم و حەواندنەوەی ڕوحم هەمووی نیعمەتی تۆن زمان لالە لە سوپاس و ستایش کرن لە تۆ کەخاوەنی هەموو شتێك بیت دەست و پەنجەم کۆڵە لە نووسینێ کەتۆ خالقی بیت چاوێ شۆڕە لە ئاستی هەڵهێنانی کاتێ

تۆ دروستت کردبێ تەنها مەگەر بۆ بیر کردنەوە ی نیعمەتـەکانت بـێ ، خوای تعالی زمـانێ کـەنازانێ چۆن حـەقی شـوکرت بـدات کـە بەنـدەش یەکێکم لەوانە بە شوکرانە بژێر حسابم بکە ، خوای تعـالی هـەر کەسـێ کەمانـدووبوە لـە گەڵمـدا بـە بەهەشـتی خـۆت پاداشـتی بدەیتــەوە و بیکەیتـە هۆکـارێ بـۆ ڕزگـاری قیامــەتمان هـەر دەسـتێکی خێـری لـە نووسـنەوەی ئـەم پەرتوکـە بەشـداربوبێ داوا لـە خـوای تعـالی ئەکـەم بەفیردەوسی ئەعلی پاداشتان بداتەوە آمین.




فیتنەکان زۆرن فیتنەی حەڵاڵ و حەڕام
لە تەواوی دونیاو کۆمەڵگا ئیسلامیە کانیش
ئەوەتا ڕیبا حەڵاڵ دەکرێت ، مۆسیقاو ڕەقس
و سەما ناو دەبرێ بەفەن !! تێکەڵی ژن و پیاو
بەناوی کۆڕو سیمینار ناو دەبرێت بە بەرەو
پێش چوون و پێشکەوتن!!! عەرەق ناو دەبرێ
بەمەشروباتی ڕۆحی !!! مۆسیقاو زورناو
شمشاڵ و تەپڵ ناو دەبرێ بە چێژی ڕۆحی
!!! بێگومان ئەوەی کەئێستا ناو دەبرێ بە
چێژی ڕۆحی ماڵی زۆرێک لە مووسڵمانانی
گرتۆتەوە ئەگەر دەرگاکانی لێدابخرێ هەر
خۆی بەژووردا دەکات

**ژمارەی سیاردن ( ١٩٩٧ )**